
İ. DH 346/22819

İ.DH.00346

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>00346.022819</td><td>8 ڕەمەزان 1272</td></tr>
<tr><td colspan="3">جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>بـۆ حەواڵەکردنـی داهاتـی دەیەك و ڕسـوماتی سـانجەقەکانی کەرکووك و کۆی و زنگبـار، لە نەزارەتی دارایی شـکۆدار پێنـج پارچـە ڕاپـۆرت لەگـەڵ پوختەکەی بەیەکـەوە ڕاگەیەندراوە و پێشـکەش کـراوە، داهاتی ناوبراو کە لـە ڕاپۆرتەکە باسـکراوە، بـە ڕاگەیاندنـی حەواڵـەی داواکارەکان دەبێـت، سـەبارەت بـە حەواڵـە کردنـی بـۆ نەزارەتـی ناوهاتـوو جەنابـی شاهنشـا بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرموویـت ئـەو جێبەجـێ دەکرێـت، بـۆ ئەمـەش نـووسراو کـرا ئەفەنـدم.</td></tr>
</table>




AE.SMHD.I.00039.02308.001

| 4 جەمادی یەکەم 1275 | 00039.02308 | AE.SMHD.I |
|---|---|---|
| لە گوندی حاجی ئیسحاق و ئەوانی تردا کە سەر بە سانجەق و ناحیەی کەرکووکە، ٨٠٠٠ ئاقچە تیمار بە فەرمانی شەریفی عالی خەلیل وەلەدی حوسێن بەڕێوەی دەبات، دوای مردنی تیمارەکە بەبێ خاوەن ماوەتەوە، دوای خەلیل بدرێتە حوسێن وەلەدی مستەفا بە فەرمانی عالیشانی سەدەقە و میهرەبانی رابگەیەنێت، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات. بەندە پارێزگاری بەغداد | | |




| İ.MVL | 00419.018342 | 18 زیلقەعدە 1275 |
| --- | --- | --- |

بــە تێروانیــن لــەم دوو راپۆرتــەی کــە لــە نەزارەتــی دارایــی لــە مێــژووی ٣ زیلقەعــدە ١٢٧٥ حەواڵــەی ئەنجوومەنــی واڵا کــراوە، لــە دانیشــتوانی قــەزای کــۆی ســانجەق دەرویــش عوســمان بەهــۆی مردنیــەوە مووچەکــەی کــە ١٧٠ قوروشــە بــێ خــاوەن ماوەتــەوە، لــەم مووچەیــە ١١٠ قــوروش بــۆ خانەدانــی کەرکــووك ســەعدوڵڵا ئاغــا دابیــن بکرێــت، ٦٠ قوروشــەکەش بخرێتــە ســەر مووچــە کۆنەکــەی جەرجیــس ئەفەنــدی دانیشــتووی روانــدز، بــۆ جێبەجــێ کردنــی ئــەم کارە دراوەتــە نەزارەتــی ناوهاتــوو لــە ئەنجوومەنــی واڵاش نــووسراوی بــۆ کــرا، لــەم بابەتــە بریــار و فەرمــان بــۆ جەنابــی ئــەو کەســەیە کــە فەرمــان دەردەکات.




A.}MKT.MHM.00199.00042.001

| A.MKT.MHM | 00199.00042 | 22 رەبیعی کۆتایی 1277 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
لە قەزای کۆی سانجەق سەر بە ئەیالەتی شارەزوور بریار لە سەر فرۆشتنی مولکی میری دراوە، بە ڕێگەی زیادکردن بریار دراوە بچێتە سەر ناوی کەرکووکی ئیسماعیل بەگ و محەمەد ئەمین ئاغا، خانەکە بە ٤٠٠٠ قووروش مەزەندە کراوە، بە پۆستە نێردراوە، لە بارەی ڕێکخستن و ناردنی سەنەدەکانیش لە ئەنجوومەنی شارەزوور بریار نامە هاتووە، بە هاوپێچ سەنەدەکەش بە پۆستە دەنێردرێت، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




A.}MKT.NZD.00379.00039.001

| A.MKT.NZD | 00379.00039 | 15 جەمادی یەکەم 1278 |
| --- | --- | --- |
| بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>هەژمارکردنی ژمارەی سەرمەڕەکانی ساڵی ١٢٧٦ی قەزاکانی کەرکووك و کۆی سانجەق و هەولێری سەر بە ئەیالەتی شارەزور، رسوماتەکەی گەیشتۆتە ٧ یوك ٧٠٩٠٠٠ و هەندێك قوروش هەروەها لە قەزای کەرکووك بۆ رسوماتی هەژماری سەرمەڕەکانی هۆزی ئەلعوبێد و ئەبوفرج مەفرەج و ئەلغەریر، یەك پارچە نووسراو لەلایەن جەنابی پاشای قائیمقامی ئەیالەتی ناوهاتوو هاتووە و بۆ سەروو نێردراوە، بۆ جێبەجێ کردنی هیممەت بکرێت. | | |




A.}MKT.UM.00529.00092.002

| A.MKT.UM | 00529.00092 | 27 جەمادی کۆتایی 1278 |
|---|---|---|

راگەیەندراوی بەندەیە
ئـەو بەندەیـە لـە دانیشـتوانی قـەزای کـۆی سـانجەقی سـانجەقی کەرکووکـە، لـە خانـەی ئاغـای کەرکـووک ٥ یـوك تووتنـم پارێـزراوە، ئـاوا بـاس دەکـەن کـە لـە ژوورەوە تێـك دەچێـت و لەلایـەن هەندێـك کەسـەوە وەکـو ئـەوەی خاوەنـی بـن دەسـتکاری دەکـەن، لـەم بارەیـەوە زوڵـم لـێ دەکرێـت، لەلایـەن وەکیلەکـەم سـلێمان ئەفەنـدی لـە کەرکـووك سـەیری ژوورەکـەم کـراوە ئـەو تووتنـەی کـە هەیـە فرۆشـتویەتی، ئـەو پارەیـەی کـە وەرگیـراوە، بـۆ ئێمـەی ناردووە، رێگـە لـەو کەسـانە بگیرێـت کـە دەڵێـن ئـەو کەلوپەلانـە هـی ئێمەیـە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە تـکا دەکـەم جەنابـی موتەسـەرفی شـارەزوور تەقیەددیـن پاشـا یـەك پارچـە فەرماننامـە دەربـکات، لـە هـەر حاڵەتێکـدا بریـار و فەرمـان بـۆ ئەفەندیمانـە.
بەندە ئەحمەد دوخانچی لە شارەزور


İ.DH 498/33850

İ.DH.00498

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>00498.033850</td><td>28 ڕەبیعی کۆتایی 1279</td></tr>
<tr><td colspan="3">جەنابی میهرەبانی ئەفەندم<br>ئەمجارە لەلایەن دانیشتوان و فەرمانبەرانی سانجەقەکانی بەغداد و سلێمانی بە جێگیر کردنی ڕەزامەندی داواکاریەکە دەرچووە، بە کۆکراوەیی ١ یوك و ٦٤,١٣٠ هەروەها لە ناو ئەیالەتی شارەزور لەلایەن دانیشتوانی کەرکووکەوە ٣٢,٤٠ قوروش دراوە، لیستی ئەم پارەیە نێردراوە، بەم ووتەیە والی بەغداد جەنابی میری میرانی پاشا لەگەڵ قائیمقامی سلێمانی دوو پارچە نووسراو هاتووە و لەگەڵ دەفتەر و بریارنامەی ئەنجوومەنی شارەزور بەیەکەوە ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە تاوەکو بدرێتە جەنابی پاشا، ئەو لیستانەی کە باسکراون، هێشتا لیستی لەم جۆرە لە خەزینەی شکۆدار قەبوڵ کردنی بۆ ڕێك دەخرێت، لە بارەی کەمکردنەوەی پارەکە حەواڵەی نەزارەتی دارایی شکۆدار کراوە، بۆ چاك کردنیشی وەڵامنامە لە خۆچێی هاتووە، بریار و فەرمانی جەنابی شاهنشا هەر چییەك بێت بە گوێرەی ئەو جولە دەکرێت، بەم ڕاگەیاندنە نووسراوی نووسراوە ژمارەی لەسەر تۆمار کرا ئەفەندم.</td></tr>
</table>



| MVL | 00768.00063 | 21 جەمادی یەکەم 1280 |
|---|---|---|

بریارنامە
٥٣١
نـووسراوی والـی بەغـداد جەنابـی پاشـا کـە لـە ١٥ جەمـادی یەکـەم ١٢٨٠ و ١٣ مایـس ١٢٧٩ دەرچـووە حەواڵـەی ئەنجوومەنـی واڵا کـراوە، سـامی ئەفەنـدی بەڕێوەبـەری قـەزای کـۆی سـانجەق سـەر بـە سـانجەقی شـارەزور ئەرکەکـەی گواسـتۆتەوە بـۆ نەزارەتـی دوخـان لـە بەغـداد، لـە شـوێن ئـەو لـە خانەدانـی حەلـەب ئەمیـن ئەفەنـدی کـە لـە کەرکووکـە بـە وەکالـەت بـە بەڕێوەبـەر دامـەزراوە، لـە بـارەی کارەکـە ئـەوا پەسـەند کـراوە، هەروەهـا وێنـەی ئامـاژە پێکردنەکـەی بـە گوێـرەی بەرژەوەنـدی دروسـتە، بـە مووچـەی ٣٠٠٠ قـوروش کـە بـۆی دابینکـراوە ئەمیـن ئەفەنـدی دەسـت بـەکار دەبێـت، لـە خەزینـەش کارەکـە جێبەجـێ کـراوە، حەواڵـەی نەزارەتـی دارایـی کـراوە، نووسراویـش ئامادەیـە.




Y.PRK.ASK.00041.00005.001

<table>
<tr><th>14 زیلقەعدە 1300</th><th>00041.00005</th><th>Y.PRK.ASK</th></tr>
<tr><td colspan="3">لە پلەوپایەی سەر عەسکەر<br>قەڵەمی تۆمار<br>تایبەتی<br>تابـوری سـێیەمی ئـاڵای ٤٥ی پیـادە بـۆ چەمچەمـاڵ و تابـوری چوارەمـی ئـاڵای ٤٦ی چەمچەماڵیـش بـۆ سـەڵاحیە و تابـوری دووەمـی ئـاڵای ٤٥ی سـەڵاحیە بـۆ سـلێمانی و تابورەکانـی دووەم و سـێیەمی ئـاڵای ٤٦ لـە سـلێمانی بـۆ کەرکـووك دەنێردرێـن، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش فەرمـان دراوەتـە قوماندانـی لەشـکری همایـۆن لـە ئەنجـام کارەکـە جێبەجـێ کـراوە، لەسـەر ئامـاژەی قوماندانـی فرقـەی ١٢ لـە قوماندانـی لەشـکری شەشـەمی همایـۆن لـە مێـژووی ٢٢ تەممـوز ١٣٠٣ تەلەگرافنامـە هاتـووە و ئامـاژەی پێکـراوە، بـۆ راگەیاندنیشـی پەلـەی لێکـراوە، بریـا و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.<br>عەلی رزا سەر عەسکەر</td></tr>
</table>




DH.MKT.01379.00006.001

| DH.MKT | 01379.00006 | 20 سەفەر 1304 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵ
لە نێوان چەمچەماڵ و کەرکووک هۆزی شوان ۳۰ ستونیان دەرهێناوە و دزیویانە، چەند رۆژە ناردنی هەواڵ و زانیاری کێشەی تێکەوتووە، لە باش مودیریەتی تەلەگراف و پۆستەی بەغداد بە تەلەگراف ئاماژەی پێ کراوە و راگەیەندراوە، ئەوانەی بوێری ئەو کارەیان کردووە هەواڵی پێویست لە بارەیانەوە بدرێت و دەستگیربکرێن، ئەمەش بە نووسراو لە نەزارەتی پۆستە و تەلەگراف راگەیەندراوە، هەروەها بۆ ئەوەی هێڵی تەلەگراف بەم شێوەیە تووشی وێران بوون و دزین نەبێتەوە نەزارەت داوای کردووە بە پەلە کاری پێویست ئەنجام بدرێت، هیممەت بکرێت و لە ئەنجامەکەی ئاگادار بکرێنەوە.




DH.MKT.01425.00031.001

| DH.MKT | 01425.00031 | 19 رەمەزان 1304 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی بەغدادی شکۆدار

ئەو توتنانەی لە سلێمانی و کۆی سانجەق دەگوازرێنەوە بۆ بەغداد، فەرمانی پاراستنیان لە ویلایەتی شکۆدار دراوە و راگەیەندراوە، بە لەدەستدانی ئەمنیەت ئەو شتانەی کە دێت وەستێنراوە، چوار هەفتەیە نامەکان لە کەرکووك ماوەتەوە، پۆستە کار ناکات، بۆیە لەلایەن نەزارەتی رەژیەوە ئاگاداری نێردراوە، ئەگەر پێویست بکات ئەو رێگایانەی کە بۆ گواستنەوەی توتن بەکاردەهێنرێن بپارێزرێن یاخود نووسراوی فەرمانگەی رەژی شوێنەکان بە رێکوپێکی رەوان بکرێت، لە ئەفسەری رەژیوە راگەیاندن راگەیەندراوە، بۆ جێبەجێ کردنی ئاماژە بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار نێردراوە، لەبەر گرنگی بابەتەکە هەرچی زووە بە پەلە چارەسەرێك بدۆزرێتەوە، پۆستەکان بپارێزرێن و لە بارەی ئەو ئاماژەوە هیممەت بۆ پەیوەندیداری ویلایەتی عالیە.




DH.MKT.01494.00037.001

| DH.MKT | 01494.00037 | 1 ڕەجەب 1305 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
دیوانی عورفی جەنگی لە ویلایەتی شارەزور ڕێکخراوە، لە بارەی ڕێکخستن و ئەرکەوە لەلایەن هاوکاری جەنابی ئیسماعیل حەقی پاشا کە لە کەرکووکە نێردراوە، بە نووسراو بۆ لایەنی سەر عەسکەر نێردراوە، لێرە لەو ٩ نوسراوەی کە بۆ کارگێری عورفیەی دیوانی جەنگی حەواڵە کراوە، نووسراوی ژمارە ١٢٣ هاوپێچ بریارنامەی لێکۆڵینەوەی دادوەری یەکەی کارگێری عورفیە لەگەڵ بریارنامەکەی تری پەسەند کراوی دیوانی جەنگی شارەزور تێدا هاتووە، عەبدوڵڵا ئاغا و بایز و براکانی سەرۆکی هۆزی بلباس محەمەد ئەمین ئاغا لەگەڵ پیاوەکانیان بەناوی مامە شانی، ٣٢٦٣ قیران، ٥ یوك کەلوپەلی قەساب مام عەلی ئیسماعیل دانیشتوی قەزای کۆی سانجەقیان تالان کردووە و دزیویانە، بە شایەد سەلمێنراوە و پەسەند کراوە، پشت بەستن بە یاسانامەی سزای مولکیە ماددەی ٦٢ دەستەواژەی یەکەم هەروەها لە مێژووی دەستبەسەرکردنیان هەر یەکە ماوەی ٣ ساڵ بە سزای سەوڵ لێدان زیندانی دەکرێن، هەروەها لە نەبوونی ئەوان بریار درا پارەی ناوهاتوو بۆ خۆیان دەستەبەر دەکرێت، جگە لەمە بریارەکە بە گوێرەی یاسا گونجاوە، لە بارەی جێبەجێ کردنیشی لەسەر ئاماژەی والای سەر عەسکەر بە ڕەزامەندی فەرمانی پاشای جەنابی تاجدار فەرموویەتی، چۆنیەتی کارەکەش بە سەر عەسکەر ڕاگەیەندراوە، بە ڕاگەیەندراوی عالی و جێبەجێ کردنی بە فەرمان و نووسراوی پەیوەندیداری سەدارەت دەبێت و هیممەت دەکرێت لە جێبەجێ کردنی.






DH.MKT.01502.00051.001

| DH.MKT | 01502.00051 | 8 شەعبان 1305 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت

لە سەرۆکەکانی هەمەوەند مەحمود خضر لەگەڵ ١٢ کەس لە هاوەڵانی بەیەکەوە پاراونەتەوە و ملکەچی خۆیان ڕاگەیاندووە، سەرۆکەکانی تریش بەم نزیکانە خزمەتەکانیان دەبینرێت، لەم ڕووەوە ئەوانەی خزمەت و هەوڵەکانیان بینراوە لەوانە وەکیلی موتەسەرفی کەرکووك ئەدهەم پاشا و بەگی ئاڵا خەسرۆ لەگەڵ وەکیلی قائیمقامی بازیان سەید حوسێن ئەفەندی، لە بارەی پاداشتکردنیان لە ویلایەتی موسڵ تەلەگرافنامە وەرگیراوە و لە ٢٨ مارت ١٣٠٤ پێشکەش کراوە، ئەمجارە لە ویلایەتی ناوهاتوو یەك پارچە تەلەگرافنامە بە داواکردنیەوە ڕاگەیەندراوە و نێردراوە، ئەو تەلەگرافنامەیە خوێندنەوەی بۆ کراوە، دواتر لەسەر فەرمودەی جەنابی پەیوەندیداری وەکالەت، لە سەرۆکەکانی ناوهاتوو حەمە مام سلێمان لەگەڵ ١٧ کەس لە هاوەڵانی بەیەکەوە ملکەچی خۆیان ڕاگەیاندووە، هەروەها لەوە زیاتر سەرۆك نەماوە، هەمەوەندەکان دوای ملکەچ بوونی هەموویان دەنێردرێنە دەرسەعادەت، سەبارەت بە پاداشت کردنی ئەوانی تر ئەوا موتەسەرفی سلێمانی تاهیر بەگیش زیادکراوە، نووسراو کراوە، جێبەجێ کردنی بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەتە.




Y.PRK.ASK.00060.00111.001

| 15 رەمەزان 1307 | 00060.00111 | Y.PRK.ASK |
|---|---|---|
| بۆ موتەسەرفیەتی کەرکووک<br>ئـەو تەلەگرافنامەیـەی کـە ئێسـتا لـە یوزباشـی مەفـرەزەی سـوارە خەلیـل ئاغـا وەرگیـراوە، لـە پوختەکـەی دەرکەوتـووە، لـە گونـدی بادنجانـی سـەر بـە بازیـان ٦ ئەسـپ سـوار لـە هەمەوەنـدەکان رایانکـردووە، هەروەهـا لـەلای تاسـلوجەش نەبیـنراون، زانیـاری نییـە کـە لـە کـوێ شـەریان کـردووە، یوزباشـی زەینـەل ئاغـاش لـە تاسـلوجەیە، خـۆی دەچێتـە سـلێمانی بـۆ ئـەوەی لێکۆڵینـەوە ئەنجـام بـدات و بزانێـت ئـەم ٢٨ ئەسـپ سـوارە لـە کوێـن، نـووسراو کـراوە و زانیاریـەکان رادەگەیەندرێـن. | | |




کرکوک قوماندانلغندن مورود شفره تلغرافنامه

Y.PRK.ASK 61/29

Y.PRK.ASK.00061.00029.001

| Y.PRK.ASK | 00061.00029 | 10 شەوال 1307 |
| --- | --- | --- |

لە قوماندانیەتی کەرکووکەوە تەلەگرافنامەی بە شیفرە هاتووە
حوسێن عەزیز لە چەتەکانی هەمەوەند لەگەڵ ٣٢ ئەسپ سوار لە سنووری ئێران بوونیان هەیە، لە دەوروبەری گوندی تەقلتوی قەزای کۆی سانجەق بە رێکەوت رووبەرووبوونەوە روویداوە، لەوانە محەمەد کوڕی حەسەن کاك هەمەوەند بریندار بووە، لە ٤ سەر ئاژەڵیش یەکێکی لەناوچووە، یەکێکیش بە برینداری بەجێ هێڵدراوە، هەروەها ٢ سەر مایینیش دەستکەوتوون، لەلای ئێمەوە یەك ئێستر لەناوچووە، لە بەدواداچوونیش بەردەوامین، لەسەر تەلەگرافی یوزباشی حەسەن ئەفەندی لە مەفرەزەی ئێستر سوارە راگەیەندراوە فەرمان.
فەریق ئەدهەم لە قوماندانیەتی فرقەی ١٢



| MF.MKT | 000129.000081 | 28 زیلقەعدە 1307 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی مەعاریفی شکۆداری جەنابی پاشا
لەلایەن بەندەتانەوە
هـەر لـە کۆنـەوە دڵسـۆزیم بەرامبـەر ئەفەندیـم و بەندایەتیـم ڕۆژ بـە ڕۆژ زیاتـر دەبێـت، لـە هـەر پێنـج کاتـی پیـرۆز نـزای خێـر بـۆ دەوڵـەت دەکـەم و یـادی دەکەمـەوە، ئەمجـارەش لـە سـەیدەکانی بەرزنجـی و خانەدانـی کۆنـی کەرکـووك، بەڕێوەبـەری ناحیـەی سـوڵتانییە سـەر بـە قـەزای هەولێـر، بەندەتـان سـەید عەبدولرەحـمان ئەفەنـدی خـودی خـۆی کەسـێکی ڕەوشـت بـەرز و ئاسـت بـەرزە، هـەر لـە سـەرەتای ئەرکـی بەڕێوەبەرایەتیەکەیـەوە بـە شـێوەیەکی ڕێکوپێـك و بـاش خزمەتـی کـردووە و ئەرکەکـەی جێبەجـێ کـردووە، لەبـەر ئـەوەی ئەرکـی کارەکـەی لـە نەزارەتـی ناوەخـۆ پەسـەند نەکـراوە، بەنـدەی ناوبـراو نیـوەی مووچـەی پـێ دەدرێـت، ئەمـەش دەبێتـە زوڵـم، ئەمجـارە لـە ویلایەتـی موسـڵ بـۆ پەسـەندکردنی فەرمانەکـەی لـە مێـژووی ٦ حوزەیـران ١٣٠٦ ژمـارە ٢٥ نـووسراو ڕاگەیانـدراوە، لـەم بارەیـەوە سـۆز و میهرەبانـی دەوڵـەت بـۆ پەسـەند کردنـی فەرمانەکـەی و دەرچوونـی، هەروەهـا بـۆ ئـەوەی ئـەم پەرێشـانیە کۆتایـی پـێ بێـت، دڵسـۆزی و بەزەیـی دەوڵـەت بفەرمووێـت بوێریـم کـرد ئـەو داواکارییـە پێشـکەش بکـەم، بریـار و فەرمان بۆ ئەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
داواکار موعەلیمی دووەم مەکتەبی ڕوشدییەی موسڵ



DH.ŞFR.00142.00016.001

| DH.ŞFR | 00142.00016 | 12 جەمادی یەکەم 1307 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لە ٢١ کانوونی یەکەم ١٣٠٥، حەسەن ئەفەندی لە موسڵ و حاجی مستەفا ئەفەندی لە کەرکووك و عەلی بەگ لە سلێمانی و ئەحمەد ئاغا لە هەولێر و ئەحمەد ئەفەندی لە رواندز و عەبدوڵلا ئاغا لە کۆی سانجەق و حاجی محەمەد شەریف لە عەقرە و سەید حوسێن ئاغا لە سەلاحیە لە سەرۆکایەتی شارەوانی دەست بە کار دەبن، رادەگەیەندرێت.<br>تاهیر والی موسڵ | | |



| 7 سەفەر 1307 | 01663.00015 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لـە شـارۆچکەی کۆپـری دادوەرێـك کۆچـی دوایـی کـردووە، جگـە لـەوە هیـچ شـوێنەوارێکی کۆلێـرای پێـوە دیـار نەبـووە، بـە گوێـرەی ئـەو فەرمانـەی کـە لەشـکری چوارەمـی هومایـۆن داویەتـی، بـە پشـت بەسـتن بـە فەرمانەکـە لەلایـەن وەکیلـی قوماندانـی کەرکووکـەوە هێڵـی پاراسـتنی تەندروسـتی هەڵگیـراوە، لـەم حاڵەتـە هێڵـی پاراسـتنی موسـڵ ٩ کاتژمێـر دووری ناوچەکانیانـە، قەزاکانـی هەولێـر و کـۆی سـەنجاق و رانیـە، لـە نـاو ئـەو هێڵـەن و بـەم شـێوەیەش دەمێننـەوە، بـە پێـی لێکۆڵینـەوە ئەگـەر پێویسـت بـکات لـەم ناوچانـە بـۆ هـەر یەکـە برێـك سـەرباز جێگیـر بکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش تەلەگـراف لەلایـەن موشـیری ناوبـراو دراوەتـە ویلایەتـی دیاربەکـر، هەروەهـا بـە پشـت بەسـتن بـە هەندێـك ووتـە تەلەگرافنامـەی پزیشـکی پاراسـتن خانـە، هەروەهـا ئـەو تەلەگرافنامـەی لـە ویلایەتـی موسـڵ وەرگیـراوە، لەگـەڵ دوو پارچـە مامەڵـەی وەرگیـراو بـە هاوپێچـی نێردراوە،بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکـە لـە نەزارەتـی ناوبـراو فەرمـان دراوە.





| 12 سەفەر 1307 | 01664.00083 | DH.MKT |
|---|---|---|

لە نێوان هومایۆن و باش کیتابەتی شکۆدار
لـە سـلێمانی کۆلێـرا سـەری هەڵـداوە، بـۆ ئـەوەی لەلایەنـی ووشـکانی کـەس تێنەپەڕێـت، لـە خاڵـی ئاڵتـون کۆپـری کاری ئامـادەکاری پێویسـت ئەنجـام دراوە، لـە کۆتایـی لـەوێ دادوەرێـك مـردووە، دوای لێکۆڵینـەوە لـە خاڵـی نـاو هاتـوو ٢٠ کاتژمێـر دووریەکەیەتـی، هـەوڵ بدرێـت کـەس لـە نێـوان زابـی سـەروو و ویلایەتـی موسـڵ تێنەپەڕێـت، سـەرەتا بـە تەلەگـراف لـە ویلایەتـی موسـڵ روون کراوەتـەوە، لـە شـارۆچکەی کۆپـری دادوەرێـك کۆچـی دوایـی کـردووە، لـەوە زیاتـر شـوێنەواری کۆلێـرا نەبیـنراوە، بـەو هێڵـە تەندروسـتخانەیەی کـە دانـراوە، بـەو فەرمانـەی کـە بـە موشـیرەتی لەشـکری چوارەمـی هومایـۆن دراوە، لەلایـەن وەکیلـی قوماندانـی کەرکـووك هەڵگیـراوە، بـەم شـێوەیە هێڵـی پارێـزگاری دووریەکەیـان ٩ کاتژمێـرە، قەزاکانـی هەولێـر و کـۆی سـەنجاق و رانیـە لـە نـاو ئـەو هێڵـە تەندروسـتخانەیە دەمێننـەوە، ئەگـەر پێویسـت بـکات لـەم شـوێنانە بـۆ هـەر یەکـە برێـك سـەرباز دابنرێـت، ئـەو پاراسـتنخانەیە لـە سـەر ئـاگاداری پزیشـك لـە ویلایەتـی ناوبـراو تەلەگرافنامـە هاتـووە، بـە گفتوگـۆ لەگـەڵ نەزارەتـی تەندروسـتی شـکۆدار، لـە وەڵامـدا ئەگەرچـی لـە گونـدی ئاڵتـون کۆپـری دادوەرێـك بـە کۆلێـرا مـردووە، دواتـر بـە مـاوەی ٧ تـا ٨ رۆژ لـەوێ شـتێك رووی نـەداوە، شـوێنی ناوبـراو لـە ژێـر هێڵەکـە دانـراوە، ئامـادەکاری پاراسـتنی بـۆ کـراوە، هەروەهـا لـە دەرەوەی ئـەو هێڵـە، تـا ئێسـتا هیـچ شـوێنەوارێك نەبیـنراوە، لـە ئێسـتادا پێویسـت نـاکات ئـەو هێڵـە بگوازرێتـەوە زابـی سـەروو هـەر لـە شـوێنی خـۆی بمێنێتـەوە، ئـەو زانیارییـە روون کراوەتـەوە و نێـردراوە، بریـار و فەرمـان.




DH.MKT.01688.00014.001

| 16جەمادی کۆتایی 1307 | 01688.00014 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
پێشـەکی هەندێـك ووتارخوێنـی ئایینـی نێردراوەتـە ویلایەتـەکان، وەکـو ئەمانە موسـڵیش پێویسـتی بـە ووتارخوێنی ئایینیـە، هەروەهـا لـە زاناکان شـێخ رەسـول ئەفەنـدی خـودی خـۆی بـە ووتارخوێـن و ئامۆژگاریکردنـەوە سـەرقاڵە، یـا ئەوەتـا مووچەیـەك بـە بـری ١٥٠٠ قـوروش بـۆ ئەفەنـدی ناوبـراو ببرێتـەوە و بـە شـێوەی گـەرۆك بـۆ ویلایەتەکانـی بەهیـە دابمەزرێـت، یاخـود بـرە پـارەی ناوهاتـوو بـۆ سـێ بـەش دابـەش ببێـت، یەکێـك بـۆ موسـڵ و دووەکـەی تریـش بـۆ سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی بێـت، جگـە لەمـە رەسـول ئەفەندیـش بنێردرێتـە سـلێمانی، ٢ کەسـی ئایینـی هەڵبژێردرێـن و دابمەزرێـن، پێشـەکی ئـەو نووسراوانـەی لـە ویلایەتـی بەهیـە نێـردراوە، لـەم بابەتـەدا خوێندنـەوەی عالـی بـۆ دەکرێـت و ئامـاژەی پـێ دەکرێـت، بـە تێروانین لـە وێنـەی ئاماژە پێکردنەکە بـە گوێـرەی ئـەو خوێندنـەوەی واڵا بـۆی دەکات، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی ئامـاژە پێکردنەکـە.

| MV | 00065.00007 | 3 سەفەر 1308 |
|---|---|---|

پوختەی دارایی

هەمەوەنـدەکان لـە شـەش هـۆز پێکهاتـوون، لـە هـەر یەکەیـان یـەك کـەس بـە شـێوەیەکی هەمیشـەیی وەکـو کەفیـل لـە کەرکـووك نیشـتەجێ بکرێـن، لەگـەڵ قەبـوڵ کردنـی ملکـەچ بوونیـان لـە قـەزای بازیـان نیشـتەجێ بکرێـن، بـۆ ئەمـەش پێویسـت بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا دەبێـت هەروەهـا خەرجـی پـارە لـە ویلایـەت رێـك دەخرێـت، جگـە لەمـە ناوبـراون پێویسـتیان بـە بـری چەنـد دانەوێڵـە هەیـە، بـە راگەیەندراوێـك ویلایەتـی موسـڵ ئـاگادار کراوەتـەوە، بەرپرسـەکانی ناوبـراوان هاتوونەتـە کەرکـووك لەگـەڵ ئـەو شـەش کەسـەش ئەوانـەی لەگەڵیـان هاتـوون لـە نیشـتەجێ کردنیـان لـە گونـدەکان بـۆ بەرێوەبـردن و دانەوێڵـە بـە گوێـرەی پێداویسـتی خۆیـان بۆیـان دابیـن دەکرێـت، بـە تەخمینـی ٦٠٠٠ قیـە گەنـم و ٣٠٠٠٠ قیـە جـۆ بـە رێکخسـتنی ٢٧٠٠٠ قـوروش دابیـن دەکرێـت، جگـە لـەوە بـۆ ئـەو شـەش سـەرۆکە بـۆ هـەر یەکەیـان ١٠٠٠ قـوروش مووچەیـان پـێ بدرێـت، هەروەهـا لـە کەرکـووك لـەو فەرمانبـەرە سـەرۆکانەی کـە لـە کەرکـووك نیشـتەجێ دەکرێـت رەشـید حەیـدەر بـە وەرگرتنـی رەزامەنـدی لـە سـلێمانی بـە ئاغـای بلۆکـی پۆلیـس بەکاردەهێنرێـت، لـە کەسوکارەکانیشـی ١٠ کـەس دەخرێنـە نـاو سـلکی پۆلیـس، سـەرۆکی فرقەکـەی تـری هەمەوەندەکانیـش حوسـێن عەزیـز ئاغـا، وەکـو ئاغـای بلۆکـی پۆلیـس و یاریـدەدەری ئاغـای بلـۆك دادەمەزرێـن، لـە وەڵامـدا تەلەگرافنامـە لـە ٢٧ مایـس ١٣٠٧ هاتـووە و خوێندنـەوەی بـۆ کـراوە.

بریار

بـە تێروانیـن لـە وێنـەی ئامـاژە پێکراوەکـە ئـەو زەخیرەیـەی باسـکراوە هەشـت یەکـی دەکاتـە ٢٠٠٠٠ قـوروش پـارە لـە ویلایـەت رێـك دەخرێـت، جگـە لەمـەش بـۆ سـەرۆکەکانیش هـەر یەکـە ١٠٠٠ قـوروش مووچەیـان بـۆ دابیـن دەکرێـت، لەبـارەی دامەزراندنـی ئاغـای بلـۆك و یاریدەدەرەکانـی و دامەزراندنـی ١٠ کـەس وەکـو پۆلیـس بـە گونجـاو زانـراوە، هەروەهـا سـوودەکانی بینـراوە، بۆیـە جێبەجـێ بکرێـت و بـە بریارنامـە مۆڵەتەکـەی کراوەتـە بریـار.



| DH.MKT | 01775.00081 | 13 ڕەبیعی یەکەم 1308 |
| --- | --- | --- |

بۆ ویلایەتی موسڵ
لـە کاتـی چوونـی بـۆ سـەر ئەرکەکـەی لەلایـەن چەتەکانـی هەمەوەنـد بـە بـری ٤٠ هـەزار پـارە و کەلوپەلیـان لـێ دزیـوە و بەتـاڵان بردوویانـە، خۆشـی بـە ٢٢ ئەندامـی خێزانەکـەی تووشـی تەنگانـە و پەرێشـانی بژێـوی ژیانیان بوونەتـەوە، بـۆ چارەسـەری ئـەو کێشـەیە لەلایـەن نائیبـی قـەزای هەولێـر ئەحمـەد ئەفەنـدی بـە تەلەگرافنامـە شـێخەکانی کەرکـووک ئاگادارکراوەتـەوە، بـۆ ئـەوەی پـارە و کەلوپەلـەکان بـۆ خاوەنەکـەی بگەڕێندرێتـەوە.



| 3 رەمەزان 1308 | 01827.00112 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵ

لـە کاتـی چوونـە سـەر کارەکـەی تووشـی چەتەکانـی هەمەوەنـد بۆتـەوە و ٤٠٠٠٠ قـوروش و کەلوپەلـی دزراوە، خۆشـی ٢٢ ئەندامی خێزانێکن تووشـی پەرێشـانی و ناخۆشـی بژێوی ژیان بۆتەوە، بە نیازی باشـتر کردنی بارودۆخی، نائیبـی قـەزای هەولێـر ئەحمـەد ئەفەنـدی بـە تەلەگـراف ناردوویەتـی داوای لـە شـێخەکانی کەرکـوك کـردووە، لێکۆڵینـەوە کـراوە و تاوانبـاران دەسـتگیر کـراون، داوای کـردووە کەلوپەلـەکانـی بـۆ بگەڕێندرێتـەوە، ئەمـەش بـە پێـی نـوسراوی ١٥ تشرینـی یەکـەم ١٣٠٦، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی هێشـتا کەلوپەلـەکان دەسـتی بەسـەردانەگیراوە، ئەمجـارە نائیبـی ناوبـراو نـووسراوی بـۆ شـێخەکان نـاردووە و داوای چارەسـەرکردنی بارودۆخەکـەی کـردووە.


DH.MKT.01959.00060.001

| DH.MKT | 01959.00060 | 14 زیلقەعدە 1309 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت و نەزارەتی دارایی پایەبەرز
هەمەوەنــدەکان لــە شــەش عەشــیرەت پێکهاتــوون، لــە هــەر عەشــیرەتێك نەفەرێــك بــە شــێوەیەکی هەمیشــەیی لــە کەرکــووك بمێننــەوە، لەگــەڵ قەبــوڵ کردنــی تکاوپارانەوەیــان لــە قــەزای بازیــان نیشــتەجێ بکرێــن، لەوانــەش لــەم شــەش کەســەی کــە دێنــە کەرکــووك بــۆ هــەر یەکــە ١٠٠٠ قــوروش مانگانــە مووچەیــان بــۆ ببڕێتــەوە، ئەوانــەی لــە گوندیــش نیشــتەجێ دەکرێــن بــە تەخمیــن خــۆراك و زەخیرەیــان بــۆ دابیــن بکرێــت، بــە بڕیــاری ئەنجوومەنــی تایبەتــی بریــکارەکان لەســەر فەرمانــی پاشــای جەنابــی پاشــا لــە ١٤ تەممــوز ١٣٠٧ ژمــارە ٧٠١ نــووسراوی پەیوەندیــداری ســەدارەت و نەزارەتــی دارایــی لەگــەڵ ویلایەتــی موســڵ گفتوگــۆ لــە نێوانیــان کــراوە، گشــت کاغەزەکانــی حەواڵــەی نەزارەتــی ژمێریــاری کــراوە، ئەمجــارە ئــەو نــووسراوەی کــە نێــردراوە تێــدا هاتــووە بــۆ ئــەم شــەش کەســە لــە مێــژووی نــووسراوی ناوهاتــوو تــا کۆتایــی ســاڵی ١٣٠٧ کۆتایــی شــوبات ئــەو بــڕە پارەیــەی کــە دەدرێــت، لــە موازەنــەی ئــەم ساڵەوە دابیــن دەکرێــت، هەروەهــا لــە مارتــی ئــەم ساڵەوە تــا کۆتایــی شــوبات ٧٢٠٠٠ قــوروش لــە ســاڵی باســکراودا ڕێــك دەخرێــت، لــە موازەنــەی ســاڵی ١٣٠٩ دەنووسرێتــەوە و هەشــت یەکــی زەخیرەکــەش لــە ٢٧٠٠٠ قــوروش لــە موازەنــەی ســاڵی ١٣٠٧ ڕێك دەخرێت، بەم شــێوەیە بــە هــاوکاری پەیوەندیداری وەکالــەت بفەرمووێــت چۆنیەتــی جێبەجــێ کردنــی لــە نەزارەتــی دارایــی ئامــاژەی پێکــراوە و ڕاگەیەنــدراوە.

دارایی
بــە پشــت بەســتن بــە نــووسراو ئــەو زەخیرەیــەی کــە دەدرێــت ٢٧٠٠٠ قــوروش لــە ســاڵی ١٣٠٧ دەنووسرێتــەوە و هەژمــار دەکرێــت، لــە پارەوپولــی ویلایەتــی موســڵ ڕێــك دەخرێــت، بــۆ ئەمــەش حەواڵــە نامــە ڕێکخــراوە و نووسراوەتــەوە، بــۆ ســەروو نێــردراوە، ئەمــەش لــە نەزارەتــی ژمێریــاری ئامــاژەی پێکــراوە، بــۆ جێبەجــێ کــردن.



| 27 زیلقەعدە 1309 | 01965.00041 | DH.MKT |
|---|---|---|
| بۆ ویلایەتی موسڵ<br>هەمەوەنـدەکان لـە شـەش عەشـیرەت پێـك هاتـوون، لـە هـەر یەکەیـان بـە شـێوەیەکی هەمیشـەیی لـە کەرکـووك دەمێننـەوە، لەگـەڵ قەبـوڵ کردنـی ملکـەچ بوونیـان، نیشـتەجێ کردنیـان لـە قـەزای بازیـان و ئەوانـەی کـە هاتوونەتـە کەرکـووك بـۆ شـەش کەسـەکە، هـەر یەکەیـان ١٠٠٠ قـوروش مووچەیـان بـۆ بڕێتـەوە، هەروەهـا بـۆ ئەوانـەی لـە گونـدەکان نیشـتەجێ کـراون، زەخیرەیـان پـێ بدرێـت، بـە بوونـی فەرمانـی پاشـای جەنابـی پاشـا ئـەوەی بـاس کـراوە بـۆ ئـەم شـەش کەسـە لـە ١٣٠٧ تەممـوز ١٤ تـا کۆتایـی شـوباتی هەمـان سـاڵی ناوهاتـوو، ئـەو بـڕە پارەیـەی پێیـان دەدرێـت، لـە موازەنـەی سـاڵی ناوهاتـوو ڕێـك دەخرێـت، بـۆ سـاڵانی تریـش جێبەجـێ دەکرێـت، هەروەهـا لـەم سـاڵە لـە مارتـەوە تـا کۆتایـی شـوبات ٧٢٠٠٠ قـوروش ڕێکخـراوە و دەدرێـت، بـۆ موازەنـەی سـاڵی ١٣٠٩ و زەخیـرە لـە ٢٧٠٠٠ قـوروش لـە موازەنـەی سـاڵی ١٣٠٧ ڕێکخـراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی نەزارەتـی دارایـی ئـاگادار کراوەتـەوە، هیممـەت بکرێـت بـۆ جێبەجـێ کردنـی. | | |



DH.MKT.01976.00034.001

| DH.MKT | 01976.00034 | 27 زيلحيجه 1309 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دادوەری و سندوقی خانەنشینی شکۆدار
یاریـدەدەری لێکۆڵـەری پێشـووی بازیـان و لـە خانەدانـی کەرکـووك عومـەر زادە حاجـی سـالم ئەفەنـدی داوای تاقیکردنـەوەی بەڕێوەبـەری ناحیـەی کـردووە و قەبـوڵ کـراوە، دەسـتپێك هـۆکاری جیابوونـەوەی لـە یاریـدەدەری ناوهاتـوو، لـە نەزارەتـی شـکۆدار پرسـیار کـراوە و لـە قۆمیسـیۆنی هەڵبژاردنـی فەرمانبـەران بـە نـووسراو باسـکراوە، بـە لێکۆڵینـەوە چۆنیەتـی کارەکـە ئاماژەی پێکـراوە، سـەروو فەرموویەتـی هیممـەت بکرێـت بـۆ جێبەجـێ کردنـی.

بۆ سندوقی خانەنشینی
ناوبـراو لـە ئەسـکەلەی تـاق تـاق و نووسـینی ئەنباریـش کاری کـردووە، لـەم کارە ئەوانـەی خزمەتیـان کـردووە، مووچەکانیـان لـە ٥٪ی دەسـتی بەسـەرداگیراوە و دەسـتی بەسـەردا دەگیرێـت.


ŞD.02162.00019.001

| ŞD | 02162.00019 | 25 رەبیعی یەکەم 1309 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٥٦
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لە ناو سانجەقی شارەزور داهاتی ئێستای ناحیەی توزخورماتو بەشی خەرجی ناوەخۆ ناكات، لەبەر ئەوەی تووشی كێشە و گرفت بۆتەوە، لە كاتی خۆیدا جیابۆتەوە و بەستراوەتەوە بە كەركووك كە مەركەزی لیوای شارەزورە، لەبەر گرنگی شوێنەكەشەوە لە قەزای سەڵاحیە ٧ و لە مەركەزی لیوا ١٦ كاتژمێر دوورە، لەگەڵ پاشكۆكانی ناحیەی ناوهاتوو بەستنەوەی بە قەزای سەڵاحیە مەزبەتەی ئەنجوومەنی كارگێری لیوای ناوهاتوو هاتووە و ئاماژەی پێكراوە، چۆنیەتی كارەكەش لە ئەنجوومەنی كارگێری ویلایەت خوێندنەوەی بۆ كراوە، لە راستییدا داهاتی قەزای ناوهاتوو بەشی مووچە و خەرجی فەرمانبەرانی ناوەخۆ و سەربازانی نیزامیە و زەبتیەی ئەوێ ناكات، بەمەش تووشی جۆرەها كێشە بۆتەوە، بەم شێوەیەش تا دێت كێشەكان زیاد دەبێت، هەروەها ناحیەی توزخورماتو بە نزیكی لە قەزای ناوهاتوو بەستنەوەی بە ئەوێ سوودی بۆ قەزاكە دەبێت و كێشەكە چارەسەر دەكات، بۆیە لە مارتی ١٣٠٨ ی دارایی لە كەركووك جیابكرێتەوە و ببەسترێتەوە بە قەزای ناوهاتوو بۆ ئەمەش نووسراو بۆ پەیوەندیداری نەزارەت كراوە و ئاماژەی پێكراوە، دیسان لە هەر حالەتێك جێبەجێ كردنی پەیوەستە بە نەزارەتەوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم كەسەیە كە فەرمان دەردەكات.
والی موسڵ مۆری عەبدولقادر كەمالی




DH.MKT.00045.00037.003

<table>
<tr><th>DH.MKT</th><th>00045.00037</th><th>25 زیلقەعدە 1310</th></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی کاروباری دارایی<br>ژمێریاری هەژماری کۆن<br>ژمارە ٢٥٣<br>نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>شـەش یەکـی پشـکی گونـدی تەرجیـل سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك سـەر بـە خۆیەتـی، لەلایـەن هەندێـك کەسـەوە دەسـتیان بەسـەر داگرتـووە، بۆیـە لەلایـەن سـەید محەمـەد ئەسـعەد بـەگ داواکاری بـەرز کراوەتـەوە، لەسـەر ئـەم داوایـە لـە ویلایەتـی موسـڵ و ئەنجوومەنـی کارگێـری خۆچێـی تەحریـرات و مەزبەتـە نێـردراوە، لـەم بارەیـەوە بـۆ دووپاتکردنـەوە لـە ویلایەتـی ناوهاتـوو نـووسراو نێـردراوە، بـە پەلـە جێبەجـێ بکرێـت و رابگەیەندرێـت، نـووسراوی ١١ مایـس ١٣٠٩ ژمـارە ٢٢٦ حەواڵـەی ژمێریـاری هەژمـاری کـۆن کـراوە، لەسـەر ئـەم نـووسراو و مەزبەتەیـەی کـە سـەرەتا نێـردراوە، ووردبینـی کـراوە، بـە پێویسـت زانـراوە هەندێـك زانیـاری تایبـەت لـە خۆچێـی بێـت، لـەم بارەیـەوە لـە ویلایەتـی ناوهاتـوو لـە مێـژووی ١٣ مایـس ١٣٠٩ نـووسراو نێـردراوە تـا روون کردنـەوە بکرێـت، بـە گوێـرەی ئـەم وەڵامـەی کـە دێـت، لـە خەزینـەی شـکۆدار کارەکـە جێبەجـێ دەکرێـت و ئەنجامەکـەی رادەگەیەندرێـت، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.<br>نازری دارایی</td></tr>
</table>



| 1310 زیلقەعدە 11 | 00049.00055 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی
سـاڵح سـاڵم ئەفەنـدی لـە بەرێوەبەرایەتـی تەحریراتـی سـانجەقی کەرکـووك کـە لـە دەرچووانـی مەکتەبـی مولکیـەی شـاهانەیە، ئەرکەکانـی بـە دڵسـۆزییەوە جێبەجێ کـردووە، لە بـارەی پاداشـت کردنی لە ویلایەتی موسڵی بەهیـە تەحریـرات نێردراوە، لەلایـەن ناوبـراوەوە داواکاری نێـردراوە، هەروەهـا لـە بەرێوەبەرایەتـی تۆمـاری زانیـاری پۆسـتە دراوە، بەیەکـەوە هاوپێـچ پێشکەشـی جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەت کـراوە، هەروەهـا ناوبـراو بـە گونجـاو زانـراوە پلـەی چوارەمـی پـێ بدرێـت، بەڵام پێویسـتی بـە فەرمانـی عالی جەنابـی پەیوەندیـداری پایەبـەرزە.



DH.MKT.00062.00013.002

| DH.MKT | 00062.00013 | 19 زیلقەعدە 1310 |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆ
پێشـەکی ئـەو هەمەوەندانـە کـە لـە بەنغـازی مابوونـەوە زسـتانی رابـردوو بـە هەڵاتـووی گەراونەتـەوە بازیـان و بوێریـان کـردووە دەسـت بـە چەتەگـەری بکەنـەوە، ئـەو ئاماژانـەش لـە موتەسـەرفیەتی کەرکووکـەوە باسـکراوە، ناوبـراو بـە گـەران و سـوران دەسـتگیرکراونەتەوە، بـۆ ئـەوەی رێگـە بـە شـەر کـردن نەدرێتـەوە، بـۆ موتەسـەرفیەتی خۆجێـی نووسراوەتـەوە، چ لـە بەنغـازی بێـت یاخـود لـە شـوێنێکی تـر بێـت ئـەو شـوێنانەی لەلایـەن چەتەکانـەوە وێـران کـراوە، ئـەو چەتانـەی لـەو شـوێنانەی کـە دەدۆزرێنـەوە، بخرێنـە ژێـر نـەزارەت و چاودێریـەوە، ئەگـەر بـەم شـێوەیەش رێگـە لـە هەڵاتنیـان نەگیرێـت، دیسـان کۆمـەڵ دروسـت دەکـەن و دەسـت بـە فـراوان بوونـی چەتەگەریەتـی دەکەنـەوە، ئەوانـە هـەر یەکـە بخرێنـە ژێـر تۆمـاری دەسـتەیەکەوە، راگەیەنـدراوە لەسـەر جێبەجـێ کردنـی فەرمانەکـە.
عوسمان والی موسڵ




| 18 جەمادی یەکەم 1310 | 00077.00006 | DH.MKT |
|---|---|---|

جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی
لــە ئەشرافەکانــی ســانجەقی کەرکــووك و ئەندامــی ئەنجوومەنــی کارگێــری قــەزا ئەحمــەد بــەگ بەهــۆی کارە باشــەکانی بــە پلــەی ســێیەم ڕێــزی لــێ بگیرێــت، لــە ویلایەتــی موســڵ لــە مێــژووی ۲۲ مایــس ۱۳۰۹ نــووسراو بــە هاوپێچــەوە پێشــکەش کــراوە، بــەڵام وا بــە گونجــاو زانــراوە کــە ناوبــراو بــە پلــەی چــوارەم پاداشــت بکرێــت، جێبەجــێ کردنــی لەســەر رای پەیوەندیــداری وەکالــەت وەســتاوە.




DH.MKT.00087.00045.002

<table>
<tr><th>DH.MKT</th><th>00087.00045</th><th>6 زيلحيجه 1310</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە ٨١٥<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لە پاشکۆکانی ویلایەتی موسڵ ناحیەی توزخورماتو سەر بە کەرکووك بریکاری بەڕێوەبەری پێشووی ناحیەکە سەعدوڵلا ئەفەندی داوای کردووە لە بەڕێوەبەری ناحیەیەك دابمەزرێت، لە تاقیکردنەوەی قۆمیسیۆن بەشدار بێت، کە لێهاتووی خۆی جێگیر کرد ئەم کاتە لە شوێنێکی گونجاو وەکو بەڕێوەبەری ناحیە دابمەزرێت، بۆ ئەم مەبەستە نووسراو کرا ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>



DH.MKT.00093.00030.004

| 1310 زیلحیجە 17 | 00093.00030 | DH.MKT |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٥١
نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
شەقامی بەغداد گرنگە هەروەها خاڵێکی مەترسیداریشە، لە نێوان توزخورماتو و داقوق ناوچەی قوری چای هەیە، ئەم شوێنە جۆڵەوانی چەتەکانە، لەوێ رووداو کەم ناکات، بۆ پاراستنی شەقامی ناوهاتوو لە شوێنی قوری چای قەرەقولخانەیەکی ١٠ نەفەری دامەزرێت، لە ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی کەرکووك مەزبەتە نێردراوە، وێنەی ئەم مەزبەتەیە هاوپێچ پێشکەشی پەیوەندیداری نەزارەت کراوە، هەروەها وێنەی ئاماژەکەش هاوشێوەیە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
والی موسڵ مۆری نوری عوسمان کوڕی محەمەد



BEO.000142.010619.001

| 4 ڕەجەب 1310 | 000142.010619 | BEO |
|---|---|---|
| شیفرە بۆ ویلایەتی موسڵ<br>لە ٥ کانوونی دووەم ١٣٠٨ بۆ لێکۆڵینەوە لە بلباسەکان فەرمانبەرانی ئێران دێنە رانیە، بە مەبەستی پێشوازی کردنی فەرمانبەرەکان، یەك بلۆکی ئاڵای سوارەی کەرکووك بچێتە رانیە تا لەگەڵ ئیسماعیل بەگی قائیمقام لە پێشوازیەکە دابێت، بۆ خەرجی ئەو بلۆکە و خەرجی رێگایان فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت فەرمویەتی و لە سەر عەسکەر ئاماژەی پێکراوە. | | |



BEO.000146.010924.001

| 11 رەجەب 1310 | 000146.010924 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەرەوەی شکۆدار
ئیسماعیل بەگ قائیمقامی ئەرکانی جەنگی لە رانیەیە، یەك هەفتەیە چاوەڕێ دەکات، بۆیە هەرچی زووە بە پێویست زانراوە فەرمانبەرانی ئێران بگەنە شوێنەکە، بۆ ئەمەش لە لایەنی والای سەر عەسکەر نووسراو هاتووە، لە وەڵامی ئاماژە پێکردنەکە نووسراو لە مێژووی ٩ رەجەب ١٣١٠ ژمارە ١٧٤٣ هاتووە کە فەرمانبەرانی ئێران لە دەوڵەتی عالی بۆ رانیە بڕۆن، هەروەها ناوبراو بە تەنیا لە رانیەیە و لێکۆڵینەوەی کردووە، بە گوێرەی ئەو وەڵامە بە پەلەیەی هاتووە وەڵام دراوەتە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار و ویلایەتی موسڵ، بەڵام بەبێ فەرمانبەرانی ئێران ئەو لێکۆڵینەوەی کە کراوە تەواو نییە، هەرچۆنێك بێت دەبێ فەرمانبەرانی ئێران بێنە لای ئێمە، بۆ ئەو فەرمانبەرانەی کە دێنە لای ئێمە لە ئاڵای سوارەی کەرکووك بلۆکێك بچێتە رانیە، هەروەها خەرجی رێگای ئیسماعیل بەگ دابین بکرێت. بە ئاماژەی میری ناوهاتوو نووسراو بۆ موشیری شکۆداری لەشکری چوارەم کراوە، لە کاتی راگەیاندنی لە بارەی ناردنی بلۆکێك سوارە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت دەرچووە، لە کۆتاییدا بە لایەنی والای سەر عەسکەر راگەیەندراوە و لەم رێگایەوە ویلایەتی موسڵ ئاگاداری ناردووە، بۆ هاتنی فەرمانبەرانی ئێران بۆ رانیە ئاگاداری دراوەتە باڵیۆزخانەی تەهران و لەسەر ئاگاداری باڵیۆزخانەی ئێران تا کاری لەسەر بکرێت و هیممەت بکرێت لە راگەیاندنی ئەنجامەکەی.



BEO.000219.016370.001

| 26 زیلقەعدە 1310 | 000219.016370 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لە ناو سانجەقی کەرکووك مووچەی ژوورچیەکان لە هەر یەکە ٤ قوروش هاتۆتە خوارەوە، ئەنجوومەنی کارگێری لیوای ناوهاتوو لەگەڵ ژوورچی قەڵەمی تەحریرات حەسەن ئاغا مووچەکەی زیاد کراوە و ئەم برە پارەیە خراوەتە سەر مووچەی ناوبراو، لە ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە، ئەم شێوەیە راست نییە، ئەم زیادەش لە ٢٠ قوروش پێك دێت، تا لە شوێن خۆی کارێك دەکرێت، مووچەی ناوبراو وەکو خۆی بدرێت، بۆ ئاگادارکردنەوەی شوێنی مەبەست نووسراو بۆ نەزارەتی شکۆدار کراوە، مەزبەتەی ٢٣ زیلقەعدە ١٣١٠ ژمارە ٦٤٨ لە شورای دەوڵەت دراوەتە قەڵەمی فەرمانگەی ناوەخۆ، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




ŞD.02223.00025.002

<table>
<tr><td>ŞD</td><td>02223.00025</td><td>20 ڕەجەب 1310</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە ٢٢٦٨<br>بۆ پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی<br>ڕاگەیەندراوی بەندەمانە<br>سانجەقەکانی زور و شارەزور ناوەکانیان هاوشێوەیە، بۆیە زۆربەی نووسراوەکان بە هەڵە ڕەوان دەکرێت، لەم حاڵەتەدا کێشە دروست دەبێت، ئەم دوو سانجەقە هەر لە کۆنەوە مەرکەزەکەیان یەکیان دیر و ئەوی تر کەرکووك بووە، بۆ ئەوەی ئەم هەڵانە ڕاست بکرێنەوە، هەردوو سانجەق بە ناوی کۆنەکەیان ناوبنرێنەوە، نووسراوی موتەسەرفی سانجەقی زور هاوپێچ پێشکەش کراوە، بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکە وێنەی ئاماژە پێکردنەکە بەرز کراوەتەوە، لەسەر ڕای پەیوەندیداری سەدارەت وەستاوە، بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>نازری کاروباری ناوەخۆ</td></tr>
</table>



ŞD.03191.00087.001

| ŞD | 03191.00087 | 14 شەوال 1310 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٣
بۆ بریکاری شورای دەوڵەتی شکۆدار
بەهـۆی ئـەم لێکچوونـەی لـە نـاوی سـانجەقەکانی زور و شـارەزور دا هەیـە، لە نـاردن و گۆرینـەوەی نـووسراو و نامە زۆربـەی زۆری هەڵـەی تێـدا دەکرێـت و بـە هەڵـە دەگاتـە شـوێنی مەبەسـت، بۆیـە سـانجەقی شـارەزور بـە نـاوە کۆنەکـەی کەرکـووک نـاو بهێنرێـت، لەسـەر ئامـاژەی موتەسـەرفی زور و بریـاری شـورای دەوڵـەت بـە ڕەزامەنـدی جەنابـی مولکـدار بـە فەرمانـی پاشـا مۆڵـەت دراوە، نـووسراو لـە مێـژووی ٩ مـارت ١٣٠٩ ژمـارە ٧٨ گشـتاندنی بـۆ کـراوە و لایەنـەکان ئـاگادار کراونـەتـەوە، لـە سـەرۆکایەتی شـکۆدار بریـار و فەرمانـی هومایـۆن دەرچـووە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
نازری کاروباری ناوەخۆ

قمانداسر عسکری

مکتوبی قلمی

خصوصی

کرکوك ورانیه قضاسنده و بالك ناحیه سنده مقیم عشایر عثمانیه دن و مشاهیر اجله مشایخدن اولوب اوده بسی
سنه مقدم ایرانه هجرت و بوکره اوده بیك خانی تجاوزندن خلفا و اتباع و مریدانه و متعلقه و سائره سیله
رانیه قضاسنه تابع برجوه یاخود ابیده واقع شمامکده توطنلری استدعا ایدن شیخ کمال الدین افندی
ایله توابعنك و عشایر ایرانیه دن ماسی عشیرتی رئیسی محمد آغانك برادری کاك سلیمانك قبول التجالری
رانیه قضاسنده اراضی خالیه امیریه ده اسکانلری حقنده موصل ولایتنك اشعاری اوزرینه مجلس
مخصوص وکلاجه تنظیم اولنان مضبطه لدی العرض ایروده حدود بوینده برکونه اویغونسزلق و مشکلات
ظهورینه محل ویرلمسی لازمدن اولدیغندن شیخ موصی الیه ایله اتباعنك مقام قربت اقسام خلافت
عظمای و خاندان معالی عنوان عثمانیه و دولت علیه یه صداقتده ثابت قدم قالدرده وقتا ما اولوده
مغایر صدق و عبودیت حال و حرکتده بولنمیه جقلرینه و شاید مستقبلده دولت علیه ایله ایران دولتی بینی
بر محاربه ظهور ایدرایسه حکومت سنیه جه ویریله جك اوامره انقیاد کوستره جکلرینه و حسب الحکم
برنهج شرع شریف و اوقسم باو قسم تاوقسم ایله یمین ایدرك تأمین و قسملرینی عهد ایله تأیید ایلدکلرینه دائر
حکره اوردوی همایون مشیریته ارسال ایلدکلری حالده بروجه
بو بابده تنظیم اولنمجه تحلیف مضبطه سنك دردنجی اوردوی همایون مشیریته ارسال ایلدکلری حالده بروجه
عرض واستیذانه قبول واسکانلری و مضبطه مذکوره نك ورودنده منظور عالی بویورلرقرینه حکره دیوانه
همایونه تقدیمی خصوصنه اراده سنیه حضرت خلافتپناهی
قلمنده حفظ اولنمق اوزره عتبه علیای شاهانه یه تقدیمی خصوصنه معلومات ویرلمسی اولدیغی
ترفیقا اولنه رق و بوبابده شان الیهاء مأذونیته و داخلیه و مالیه نظارتیه جلیله لرینه معلومات ویرلمسی
بابنده مشیریته شان الیهاء تبلیغات لازمه اجراسیله مضبطه مذکوره نك ورودنده لاجل العرض ارسالی بابنده تذکره
سیله تبلیغ و اشعار بویرلمش و اولوجهله مشیریته شان الیهاء باتلغرافنامه عاجزی تبلیغات لازمه ایفا قلنمش اولمغله
موطعلم عالی بویرلمق اوزره عرض معلومات ابتدارقلندی اولبابده امر و فرمان حضرت من له الامرکدر

۱۴ جمادی الاخره سنه ۳۰۹

۱۴ ...

ضیا

Y.MTV 81/128

Y.MTV.00081.00128.001

| 14 سەفەر 1311 | 00081.00128 | Y.MTV |
| --- | --- | --- |

پایەی سەر عەسکەر
قەڵەمی تۆمارکردن
تایبەتی
لـە عەشـیرەتی عوسـمانی و شـێخە نـاودارەکان کـە لـە قەزاکانـی کەرکـووك و رانیـە هەروەهـا لـە ناحیـەی باڵـەك نیشـتەجێن، پێـش ١٥ سـاڵ بـۆ ئێـران هیجرەتـی کـردووە، ئەمجـارە شـێخ کەمالەددیـن ئەفەنـدی داوای کـردووە زیاتـر لـە ١٠٠٠٠ خانـە لـە موریـد و هـاوەڵ و لایەنگرانـی لـە بەرچـوە سـەر بـە قـەزای رانیـە یاخـود لـە شـەمامك سـەر بـە هەولێـر نیشـتەجێ بکرێـن، بـەم داواکردنـە شـێخ کەمالەددیـن ئەفەنـدی لەگـەڵ هاوەڵانـی و لـە هۆزەکانـی ئێـران کاك سـلێمان بـرای سـەرۆکی هـۆزی مامـش محەمـەد ئاغـا بـە هاتنیـان لـە بـارەی نیشـتەجێ کردنیـان لـە زەوییـە بەتاڵەکانـی میـری قـەزای رانیـە، لەسـەر ئامـاژەی ویلایەتـی موسـڵ بریارنامـە لـە ئەنجوومەنـی تایبەتـی وەکیلـەکان رێکخـراوە و لەگـەڵ راگەیاندنـی پێویسـتە لەمـە بـەدواوە بـە درێژایـی سـنوور رێگـە نەدرێـت کێشـە و سـەرپێچی دروسـت ببێـت، شـێخی ناوبـراو لەگـەڵ هاوەڵانـی سـوێند بخـوات کـە ملکـەچ بێـت و بەرامبـەر بـە حکوومەتـی عوسـمانی بـە دڵسـۆزی بمێنێتـەوە و راوبۆچوونـی جێگیـر بێـت، هیـچ کاتێـك نابـێ سـەرپێچی لـە ملکـەچ بوونـی خـۆی و دڵسـۆزی خـۆی بـکات، شـایەد ئەگـەر هاتـوو لـە داهاتـووش لـە نێـوان دەوڵەتـی عالـی و ئێـران شـەڕ روو بـدات، ئـەوا دەوڵەتـی عالـی هـەر بریارێـك بـدات دەبـێ ملکـەچ بـن، نابـێ لـە پـاڵ ئێـران شـەڕ بکـەن و دوای وەرگرتنـی دڵنیایـی بـەم شـێوەیە رێـك دەخرێـن، بریارنامـەی سـوێندخواردنیان بـۆ موشـیرەتی لەشـکری چوارەمـی هومایـۆن بنێـرن، بـەم جـۆرە نیشـتەجێ بوونیـان قەبـوڵ دەکرێـت و بـە هاتنـی بریارنامـەی باسـکراو دوای فەرمانـی عالـی لـە دیوانـی هومایـۆن هەڵدەگیرێـت، لـە بـارەی پێشـکەش کردنـی دیـاری شـاهانەی عالـی فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت مۆڵـەت لـە ویلایەتـی ناوهاتـوو دەرچـووە و زانیـاری دراوەتـە نەزارەتـی ناوەخـۆ و دارایـی شـکۆدار، بـە راگەیاندنـی راگەیەنـدراو دراوەتـە موشـیری ناوهاتـوو، لەگـەڵ هاتنـی بریارنامـەی باسـکراو بـە مەبەسـتی راگەیاندنـی بـە نـووسراوی سـەدری ئەعـزەم ئامـاژەی پێکـراوە، بەمـەش موشـیرەتی ناوهاتـوو بـە تەلەگرافنامـە ئـاگاداری پێویسـتی دەرکـردووە، بـە فەرمانـی عالـی بـە پەلـە زانیـاری راگەیەنـدرا، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
رزا سەر عەسکەر


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

DH.MKT.00100.00006.001

| 18 موحەررەم 1311 | 00100.00006 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ لایەنی واڵای جەنابی سەر عەسکەریمان
ئیسـماعیل بـەگ لـە سـاڵی ١٣٠٧ لـە قـەزای پاسـینلر فەرمانبـەر بـووە ئەرکـی پێـدراوە زەخیـرە بـۆ ئـەرزروم بگوازێتـەوە، ئەمـرۆش ئاغـای تابـووری زەبتیـەی سـانجەقی کەرکووکـە، لەبـەر ئـەوەی برێـك زەخیـرە مـاوە، سـکاڵا لـە دژی تۆمـار کـراوە، ناوبـراو دراوەتـە دادگا، وێنـەی ئـەم نـووسراوەی کـە لـە مێـژووی ٣ تەممـوز ١٣٠٩ ژمـارە ٥٥ لـە ویلایەتـی ئـەرزروم هاتـووە، هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت و هەواڵەکـە بـە سـیپاهیدار رابگەیەندرێـت.



DH.MKT.00147.00039.002

| DH.MKT | 00147.00039 | 23 ڕەبیعی یەکەم 1311 |
|---|---|---|

تەلەگرافنامەی بە شیفرەی سەرپەرشتیاری سەربازی لە قۆمیسیۆنی سەروو سەرۆکی دووەم جەنابی ئیسماعیل حەقی پاشا

ئەو هەمەوەندانەی لە بەنغازینە بە تەواوەتی هەڵاتوون، ئاوا گوێ بیست بوونە کە بە یەك و دوو کەسەوە بۆ بازیان دێن، ئەگەرچی جەنابی پاشا ئاسایشی بەرقەرار کردووە، بەڵام ئەوانە هەر دەرفەتێك بدۆزنەوە ناوەستن ئەمەش بە ئەزموون سەلمێنراوە، لەم بارەیەوە چاوەڕێی فەرمانی دەوڵەت دەکەم، فەرمان.
عارفی موتەسەرفی کەرکووك


DH.MKT.00157.00003.001

| DH.MKT | 00157.00003 | 14 ڕەبیعی کۆتایی 1311 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی زەبتیەی عالی
بەهۆی گەورەیی و گرنگی سانجەقی کەرکووك سەر لە نوێ ئەفسەرێکی پلە سێیەم و ٤ نەفەر پۆلیس دابمەزرێن و ڕەوان بکرێن، لە نووسراوی ویلایەتی موسڵ لەگەڵ مەزبەتەی ئەنجوومەنی کارگێری هاوپێچ نێردراوە، لە وەڵامدا نووسراوی عالی لە مێژووی ٣ تشرینی یەکەم ١٣٠٩ ژمارە ٢٩٥ هاتووە، دوای خوێندنەوە، بە بڕیاری قۆمیسیۆنی تایبەت بە پێویست زانراوە چاوەڕێ بکرێت.



<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>00184.00029</td><td>3 جەمادی کۆتایی 1311</td></tr>
<tr><td colspan="3">
بابی عالی<br>
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>
قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران<br>
ژمارە ٦٦٤<br>
لە ناحیەی قوشتەپەی سەر بە قەزای هەولێری سانجەقی کەرکووك، محەمەد ئاغا بە وەکالەت بەڕێوەبەرە، بەهۆی سکاڵای هاووڵاتیان، ناوبراو لەسەر کارەکەی لادراوە و ئیبراهیم ئاغا لە شوێنی ئەو دامەزراوە، بۆ ئەم مەبەستە نووسراو لە ویلایەتی موسڵ بە مێژووی ٢٠ تشرینی یەکەم ساڵی ١٣٠٩ ژمارە ١١٧ خوێندراوەتەوە، بەڵام بە پێی تۆمارەکان لە ناحیەی ناوبراو فەیزوڵڵا ئەفەندی بەڕێوەبەرە، بۆ ئەم مەبەستە زانیاری روونترمان بۆ بنێرن، بریار و فەرمان بۆ ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
</td></tr>
</table>



DH.MKT.00211.00017.001

<table dir="rtl">
<tr><td>DH.MKT</td><td>00211.00017</td><td>22 شەعبان 1311</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار<br>بە مەبەستی گۆڕینی ناوی سانجەقی شارەزور کەسێك بە ناوی فەرمانبەری ناسنامەی سانجەقی کەرکووك ئەرکی پێ بسپێردرێت و ڕەوان بکرێت، بۆ ئەمەش نووسراوی مێژووی ٦ کانوونی دووەم ١٣٠٩ ژمارە ١٧٧ ئاماژەی پێکراوە، سەر لە نوێ مۆرێکی نوێ دروستکراوە و بە ڕادەست کردنی قەپوکەتهودا ڕەوان کراوە، لەسەر چۆنیەتی کارەکە و ئاماژە پێکردنیەوە و هەڵوەشاندنەوەی مۆرە کۆنەکە زانیاری لە کارگێری ناسنامەی گشتی تۆمار کراوە، لەم بابەتەدا هیممەت بکرێت.</td></tr>
</table>




DH.MKT.00213.00027.003

| DH.MKT | 00213.00027 | 28 شەعبان 1311 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار
لە قەزای سەڵاحیە پروپاگەندەی ئەوە کراوە کە فەرمانبەری هۆبەی ئەملاکی همایۆنی پێشوو ساڵح بەگ ٢٥ لیرە بەرتیلی بۆ فەرمانبەری لێکۆڵینەوە بینباشی رەفعەت بەگ ناردووە، بۆیە لە دژی داواکاری بەرز کراوەتەوە، لە ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی کەرکووك بە دادگایی کردنی ساڵح بەگ بێتاوانی بۆ دەرچووە و لەلایەن داواکاری گشتی ئەنجوومەنی کارگێری لیوای ناوهاتوو بریارەکە پێداچوونەوەی بۆ کراوە، بۆ پەسەند کردنی بریارەکە لە فەرمانگەی دادگاکانی شورای دەوڵەت ئیعلام لەگەڵ نووسراوی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیداری سەدارەت لە مێژووی ١٤ شوبات ١٣٠٩ ژمارە ٣٣٠٢ هاوپێچ رەوان کراوە، لە چۆنیەتی کارەکەش ئاگاداری دراوەتە نەزارەتی خەزینەی تایبەتی شکۆدار لەگەڵ سەرۆکایەتی قۆمیسیۆنی تۆماری زانیاری عالی.




DH.MKT.00226.00034.004

| DH.MKT | 00226.00034 | 20 شەعبان 1311 |
|---|---|---|
| ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی تۆمار<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لـە ئەرکەکەیـەدا هەروەهـا لـە حەواڵـە کردنـی دە یەکـی قـەزای هەولێـر کاری باشـی کـردووە و کەموکـوری نەبـووە، بۆیـە شـایەنی ئەوەیـە پاداشـت بکرێـت، پلەکـەی لـە سـێیەم بـۆ پلـەی دووەم بـەرز بکرێتـەوە، بـە نـووسراوی مێـژووی ١٨ ئۆغسـتۆس ١٣٠٩ ژمـارە ٨٣ کۆتایـی پـێ هاتـووە، بەڕێوەبـەری تەحریراتـی سـانجەقی کەرکـووك عەبدولرەحـمان ئەفەنـدی، لـە نـووسراوی موتەسـەرفی لیـوای ناوهاتـوو هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە پاداشـتەکەی دووپاتکراوەتـەوە، لـە بـارەی جێبەجـێ کردنـی کارەکـە هـاوکاری شـکۆداری پێویسـتە، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.<br>والی موسڵ | | |



| DH.MKT | 00245.00034 | 29 زیلقەعدە 1311 |
|---|---|---|
| بۆ پەیوەندیدارانی سەدارەت<br>لە قەزای هەولێری سەر بە سانجەقی کەرکووک، ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێری حاجی خضر ئاغا بەهۆی کاری باش و هاوکارییەکانی لە رووی کارگێرییەوە، ئەرکەکەی لە پلەی پێنجەم بۆ پلەی سێیەم بەرز بۆتەوە، ئەو نوسراوە لە مێژووی ٥ شوبات ١٣٠٩ نێردراوە. | | |



| DH.MKT | 00246.00036 | 3 زیلحیجة 1311 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ئۆفیسەکانی گشتی سەربازی شاهانە
لەبــەر ئــەوەی شــارەوانی پزیشــکی ســەنجەقی کەرکــووک بەتاڵــە، مووچەکــەی لــە فەرمانگــەی شــارەوانی پــێ دەدرێــت، هەرچــی زووە وا پێویســت دەکات لــە ویلایەتــی موســڵ کەســێك دابمەزرێــت، بــۆ ئــەم مەبەســتەش بــە مێــژووی ١٣ ئۆغســتۆس و ١٠ تشرینــی یەکــەم و ٢٠ تشرینــی دووەم ١٣٠٧ نــووسراو بــۆ نــەزارەت و نەزارەتــی پزیشــکی نێــردراوە، کەچــی تــا ئێســتا وەڵامێــك نەهاتــووە. هەروەهــا ئەمجــارە لــە ویلایەتــی ناوبــراو بــە مێــژووی ١٤ مایــس ١٣١٠ تەلەگرافنامــە نێــردراوە تــا بــۆ هــەر یەکــە لــە ســانجەقی کەرکــووک و قــەزای هەولێــر پزیشــکێك دابمەزرێــت و بنێردرێــت و دووپــات کراوەتــەوە کــە بــە پێــی تێروانینــی پێشــوو جێبەجــێ بکرێــت.



| BEO | 000267.019983 | 14 سەفەر 1311 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار

لـە قـەزای رانیـەی سـەر بـە کەرکـووك، خەڵەکانـی جنـاران و پاشـکۆکانی کـە لـە ٣٤ گونـد پێـك دێـت، مـاوەی ١٥ سـاڵ لەلایـەن فەرمانبەرانـی قـەزا بـەوەی لـە ٣٢ گونـد پێـك دێـت، لەگـەڵ ٣٠٠٠٠ قـوروش حەواڵـەی حەمیـد ئاغـای دانیشـتووی کـۆی سـانجەق بـووە، لەسـەر ئـەم هەواڵـە لـە خەزینـەی شـکۆدار بـە وەرگرتنـی خزمەتێـك بـە نیـوە کـە دەکاتـە ١٧ گونـد بەرامبـەر ٥٤٠ لیـرە بـە رێگـەی ئیلتیـزام لـە دەسـتەی قـەزا بـە هـۆی سـوودی هاوبەشـەوە پێشـوەختە حەواڵـەی حەمیـد ئاغایـان کـردووە، بـۆ داواکردنـی پاراسـتنی مافـی سـوودەکانی دەوڵـەت بـە واژووی مەحمـود لـە کەرکـووك تەلەگرافنامـە لـە مێـژووی ١٢ ئۆغسـتۆس ١٣٠٩ بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، چۆنیەتیشـی لـە ویلایـەت بـە تەلەگرافنامـە زانیـاری نێـردراوە، لـە نەزارەتـی شـکۆدار لێکۆڵینـەوەی پێویسـت ئەنجـام بدرێـت و هیممـەت بکرێـت لـە راگەیاندنـی ئەنجامەکـەی.



| 22 سەفەر 1311 | 000270.020198 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لـە دانیشـتوانی موسـڵ سـەعید بـەگ و ڕەئـوف بـەگ لەگـەڵ حاجـی محەمـەد لەسـەر کارە نەگونجاوەکانیـان بـە ئامـاژەی ویلایەتـی موسـڵ ماوەیـەك لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی بـە ئـەرك نیشـتەجێ بکرێـن، بـۆ ئـەم مەبەسـتە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت دەرچـووە، لـە مابەینـی هومایۆنـی بـاش کیتابەتـی شـکۆدار بـە نـووسراوی تایبەتـی ئامـاژەی پێکـراوە، چۆنیەتیشـی بـە تەلەگـراف نـووسراو بـۆ ویلایەتـی ناوهاتـوو ڕۆیشـتووە، لـە نەزارەتـی شـکۆداریش هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.


BEO.000395.029624.001

| 27 شەوال 1311 | 000395.029624 | BEO |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵ
لـە ٢٢ مـارت ١٣١٠ لـە سـەدا ٨٠ی هێـزی سـەربازی لـە نـاو ویلایـەت لـە کاروبـاری مولکیـە و هەندێـك شـوێندا بوونیـان هەیـە، دروسـت کردنـی هێزێکـی تێکەڵـی سـەیارە مەحاڵـە، بـەم شـێوەیەش ئەگەرچـی سـەردانی لایەنـی پەیوەندیـدار کـراوە، بـەڵام هەرچـی زووە نەفـەر و ئاژەڵـی تابـووری ئێسـتر سـوارە ژمارەکـەی بکرێتـە ٥٠٠، تەنیـا ٣٠٠ بـۆ سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی و ٢٠٠ یشـی بـۆ مەرکـەزی موسـڵ ڕەوان بکرێـت و نیشـتەجێ بکرێـت، بـۆ ئەمـەش لەلایـەن موشـیری لەشـکری شەشـەم وەڵام بـۆ پایـەی سـەر عەسـکەر نووسراوەتـەوە، لـە تەلەگرافنامەکانـی ١ و ٢٦ی کانوونـی دووەم ١٣٠٩ نووسراوەتـەوە، یـەك بـە یـەك نەفـەر و ئاژەڵـی تابـووری ئێسـتر سـوارە دەگەیەندرێتـە ٥٠٠ و ئـەم ئێسـترانەی کـە دەکرێـت، هەشـت یەکـی لـە لەشـکری ویلایـەت ڕێکخـراوە، هەرچـی زووە ئـەوەی ماوەتـەوە دابیـن بکرێـت.




ŞD.02166.00007.007

<table dir="rtl">
<tr><th>ŞD</th><th>02166.00007</th><th>22 شەوال 1311</th></tr>
<tr><td colspan="3">شورای دەوڵەت<br>فەرمانگەی ناوەخۆ<br>ژمارە ١٠<br>بۆ جەنابی سەر عەسکەریمان لایەنی پێشەوا<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لە ناو سانجەقی کەرکووك سەر لە نوێ لە بالیسانی سەر بە قەزای کۆی سانجەق بەڕێوەبەرایەتێك دادەمەزرێت، لە وەڵامی ویلایەتی موسڵ نووسراو بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار نێردراوە، هەروەها لە نەزارەتی ناوهاتوو بە نووسراو پێشکەشی شورای دەوڵەت کراوە و تەحریرات و هاوپێچەکان بە بریاری فەرمانگەی ناوەخۆ نێردراوەتە لایەنی سیپاهیدار، لەم بابەتەدا ئەم خوێندنەوەی لە لایەنی سەربازی کراوە، ئاماژەی لایەنی سیپاهیدار و ئەوراقەکان نێردراوەتەوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>بریکاری سەرۆکی شورای دەوڵەت</td></tr>
</table>




| ŞD | 02630.00017 | 9 رەجەب 1311 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٧٣
بۆ بریکاری سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لەبەر ئەوەی مەرکەزی قەزای رانیە لە خاڵی ناوەراست نییە، هەروەها کەشوهەواکەی بۆتە هۆکاری تێکچوونی تەندروستی فەرمانبەران و سەربازانی شاهانە، بنکەکەیان بگوازرێتەوە پشدەر، بۆ ئەم مەبەستەش پێویست دەکات قۆناغێکی حکوومەت و قشلەیەك دروست بکرێت، نووسراو لە ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی کەرکووك رێك بخرێت و لە ویلایەتی موسڵی شکۆداریش مەزبەتە نێردراوە، بە تێروانین لە دەستەواژەیەکی بە گفتوگۆ کردن لەگەڵ شورای دەوڵەت، بریارەکەی بە مەزبەتە راگەیەندراوە، بۆ جێبەجێ کردنی هیممەت بکرێت. بۆ ئەم مەبەستەش نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم

| 15 جەمادی یەکەم 1312 | 00082.00024 | MV |
|---|---|---|

پوختەی بابەت

لــە نــاو ویلایەتــی موسـڵ ئــەو زەوییانــەی کــە لــە ســانجەقی کەرکــووك بــە عەقرەلــی نــاو دەهێنرێــت، لــە خاوەنەکانیـان پشـکی مەنافیـع و مەعاریـف وەرگیـراوە، تـا خاوەنـی زەوییـەکان بتوانـن لـە هۆبـەی بانقـی زراعـەت قـەرز وەربگـرن، بـە بریـاری شـورای دەوڵـەت لـەم ئاماژەی کـە پێشـووتر هاتـووە، زەوییـە ناوهاتـووەکان ١٠ و لـە عەقـرەش ١ پشـك پـارە وەردەگیرێـت، هەرچـی ئەوانـەی کشـتوکاڵ دەکـەن بـەم جـۆرە داهاتـی دەیـەك پەکـی دەکەوێـت، لـە زەوی جـۆری عەقرەلـی وەرگرتنـی پـارە بـە ویلایەتـی ناوهاتـوو راگەیەنـدراوە، لـە نـووسراوی نەزارەتـی ناوەخـۆ کـە لـە مێـژووی ٢٤ زیلقەعـدە ١٣١٢ نێـردراوە، لەگـەڵ ئەوراقەکانـی هاوپێچ خوێندنـەوەی بۆ کرا.

بریار

بـە جێبەجـێ کردنـی لـە یەکـەم کاردا ئـەم ویلایەتانـەی کـە دراوسـێی موسـڵن، زەوی عەقرەلـی هەیـە، ئایـا پشـکی مەعاریـف و مەنافیـع وەردەگیرێـت، ئایا لە کاتی سـەردانی خاوەنەکانیـش بۆ بانقی زراعەت دەتوانن قـەرز وەربگرن، ئەمانـە بـە لێکۆڵینـەوە ئەنجامەکـەی بـە نووسراوی سـەدری ئەعـزەم بـە نەزارەتـی بـازرگان و نافیعە راگەیەنـدراوە.




Y.MTV.00100.00046.001

<table>
<tr><th>16 موحەررەم 1312</th><th>00100.00046</th><th>Y.MTV</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز<br>ژووری تەلەگراف<br>شیفرەی ئەم تەلەگرافنامەیە کە لە ویلایەتی موسڵ هاتووە<br>لە کوێستان لە نێوان عەشیرەتەکانی بلباس و ئاکۆی قەزای رانیەی سەر بە سانجەقی کەرکووك شەڕ و پێکدادان روویداوە، لە ئەنجام ١٠ تا ١٥ کەس کوژراوە و بریندار بووە، لە موتەسەرفی لیوای ناوهاتوو تەلەگرافنامە هاتووە و ئاماژەی پێکردووە کە پێویستە سەرباز رەوان بکرێت، لە سایەی جەنابی پاشاوەش لە رۆژانی رابردوو نزیك لەوێ لە قەزای کۆی سانجەق ٣ تابووری سەربازی شاهانە رەوان کراوە، بەڵام کوێستانەکە لەسەر سنوورە، بۆ ئەوەی رووداوی تر روو نەدات، لە یەکەم هەنگاودا لە زانا و شێخ و سەرۆك عەشیرەتەکان چەند پیاوماقولێکی بە توانا لەگەڵ فەرمانبەرێك بچێتە لای عەشیرەتەکان، بۆ ئاشت کردنەوەی نێوان ئەم عەشیرەتانە کار بکەن، ئەنجامی کارەکەش وەڵام بدرێتە موتەسەرفی ناوهاتوو راگەیەندراوە فەرمان.<br>والی عەزیز</td></tr>
</table>



DH.MKT.00275.00013.001

| DH.MKT | 00275.00013 | 22 سەفەر 1312 |
|---|---|---|

نووسراو بۆ ویلایەتی موسڵ
موتەســەرفی ســانجەقی کەرکــووك و بەڕێوەبــەری پێشــووی ڕەژی شــەفیق ئەفەنــدی لــە کاتــی ئەرکەکەیــدا دوژمنــی هەبووە،بۆیــە زۆر زیانــی پێگەیشــتووە، ئەمجــارە بەهــۆی کاری نەگونجــاو دوو فەرمانبــەری ڕەژی لــە کارەکانیــان دوور خراونەتــەوە، ناوبــراو خــۆی کردۆتــە خاوەنــی ئــەم فەرمانبەرانــە و هەوڵــی داوە دووبــارە بگەڕێنــەوە ئەرکەکەیــان، بــەڵام بــە گونجــاو نەزانــراوە، هەروەهــا لــە دژی بەڕێوەبــەری ڕەژی داهاتــوو حاجــی عەبدوڵــڵا ئەفەنــدی مەســەلەیەکی کوشــتنی بــە ناحــەق خســتۆتە ســەر شــانی ناوبــراو، لەلایــەن کارگێــری گشــتی ڕەژی ڕاپۆرتــی چاکبوونــەوە نێــردراوە، بــە ڕاگەیانــدن و کاروبــاری ڕەژی بــە هــاوکاری و ئاســانکاری نیزامیــەی حکوومــەت جێبەجــێ کــراوە، ئەگــەر مامەڵــە ڕاگەیەنــدراوی موتەســەرفی ناوهاتــوو ڕاســتیش بێــت، بــەڵام بــە گونجــاو نازانرێــت، بــە لێکۆڵینــەوە کارەکــە جێبەجــێ بکرێــت و ڕابگەیەندرێــت.



DH.MKT.00283.00061.001

| DH.MKT | 00283.00061 | 8 رەبیعی یەکەم 1312 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ
بەکر بەگ خەڵکی بالیسانی سەر بە کۆی سانجەقی کەرکووکە، لە فەرمانی هاتن کێشەی بۆ دروست بووە، بەڵام ناوبراو لێبوردنی عالی بۆ دەرچووە، لە دەرسەعادەت براکەی شێخ سەعید ئەفەندی لەسەر ئەو تەلەگرافنامەیەی کە بۆ نەقیبی سلێمانی ناردووە، ناوبراو ئەمڕۆ لە خانەی نەقیبی ناوهاتووە، لە بارەی ئەو مامەڵەیەی لەگەڵی دەکرێت لە موتەسەرفیەتی سلێمانی لە تەلەگرافنامە پرس و رای لەسەر کراوە، هەروەها لە بارەی لێبووردنی ناوبراو لە ویلایەتەوە هیچ زانیاریەکی لەسەر نەدراوە، بۆیە ئاماژەی مامەڵەکەی رابگەیەندرێت.
عەزیز والی موسڵ



DH.MKT.00290.00006.002

| DH.MKT | 00290.00006 | 2 رەجەب 1312 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار
لە ناو سانجەقی کەرکووك خەرجی نۆژەنکردنەوەی حکوومەتی قۆناغی ناحیەی شوان بە ئاقچەی بەها (رایج) ٣٨٠٠ قوروش دەکات، لە بارەی حەواڵە کردنی نووسراوی ١٣ ئۆغستۆس ١٣١٠ ژمارە ٨٤ حەواڵەی ژمێریاری کراوە، لە بەرامبەر خەرجی نۆژەنکردنەوە کە لە موازەنەی ساڵی ١٣١٠ی ویلایەتی شکۆدار تۆمار کراوە دەکاتە ٢٠٠٠٠ قوروش، هەروەها ئەوەی باسکراوە لە خەرج کردنی ٣٨٠٠ قوروش لە سەر رەزامەندی ویلایەت وەستاوە، بۆ رێکخستن و خەرج کردنی برە پارەی ناوهاتوو ئاگاداری رەوان بکرێت.




| 9 جەمادی یەکەم 1312 | 00305.00015 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار
جەنابی جەلال پاشا موتەسەرفی سانجەقی کەرکووك لە موش تا کەرکووك خەرجی ڕێگای هەیە، داوای دابین کردنی کردووە، بۆ جێبەجێ کردنی لە مێژووی ١١ مارت ١٣١١ نووسراوی عالی ئاماژەی پێکراوە، چۆنیەتی کارەکە حەواڵەی ژمێریاری کراوە، بری خەرجی ڕێگاکەی ٤٢٣٧ قوروش و نیو دەکات دوای گفتوگۆ کردن لەگەڵ ویلایەتی بەتلیس ئەگەر روون بێتەوە پارەکە نەدراوە، ئەوا ڕێکخستنی و دابینکردنی بە نووسراوی ١٩ کانوونی دووەم ١٣١٠ روون دەکرێتەوە ئەمەش بە تۆمار دەرکەوتووە، بە تێروانین لە گفتوگۆ هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




Y.A.HUS.00327.00103.001

<table>
<tr><th>Y.A.HUS</th><th>00327.00103</th><th>18 زیلقەعدە 1312</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٤٥٠١<br>لە ناو سانجەقی کەرکووک لە ئاغاکانی دیزەیی ئیبراهیم پیرداود لەگەڵ هاوەڵانی هێرشی کردۆتە سەر خانەی کارگێری ئەملاکی هومایۆنی شەمامك، لەلایەن سەربازانی شاهانەی جەنابی پاشا لە گوندی عەرەبکەند بە جۆرێك پەرشوبڵاوکراونەتەوە کە جارێکی تر کۆنەبنەوە، هەروەها ناوبراو لە گوندی قوتبان هەواڵی ناردووە، لە کۆتایی پیرداود لەگەڵ هاوەڵانی ئەحمەد کوچوك لە سەربازی شاهانە پاراونەتەوە تکایان کردووە، لە تەلەگرافنامەی موتەسەرفی کەرکووك هاوپێچ راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، چۆنیەتی کارەکەش بە والای سەرعەسکەر لەگەڵ نەزارەتی خەزینەی تایبەتی شاهانەی شکۆدار راگەیەندراوە.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>




ŞD.00356.00014.001

| ŞD | 00356.00014 | 3 سەفەر 1312 |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری دارایی
ژمێریاری گشتی
ژمارە ٦٧١
ڕاگەیەندراوی بەندەیە
تۆماری ناحیەی مەلحەی سەر بە سانجەقی کەرکووك کۆتایی پێ هاتووە، لە ساڵی ١٣٠٨ لە ساڵی دارایی بە تۆمارەوە باجەکەی ڕێکخراوە، بۆ دەستکەوتنی ئەم باجە لە پایەی ویلایەتی موسڵ بە نووسرا ئاماژەی پێکراوە کە ڕەزامەندی دراوە تا بە مووچەی ٣٠٠ قورووش کاتیبێکی باج دابمەزرێت، هەروەها لە ناو ویلایەتی ناوهاتوو پێشەکی ناحیەی کیل تۆمارەکەی کۆتایی پێ هاتووە، داوای کاتیبێکی باج کراوە، بەڵام داهاتەکەی ڕێگە نادات کاتیب دابمەزرێت، ئەگەرچی بۆ ناحیەی ناوهاتوو کاتیبی باج دانەمەزراوە، بەڵام ناحیەی کیل و ناحیەی مەلحە داهاتی لە ٣٩٨٠ قورووش پێك دێت، بەڵام پێویستە سەیری مامەڵەی تۆمار و باجی ئەم دوو ناحیەیە بکرێت، بۆیە پێویستە کاتیبێکی باج دابمەزرێت، بەم شێوەیە بە گونجاو زانراوە، ئەم برە پارەیە بەرامبەر مووچەی فرقەی سەیارەیە، پارەکە دەستبەسەر کراوە و وەستێنراوە، ٣٠٠ قورووش دابین بکرێت و بۆ ناحیەکانی ناوهاتوو لەگەڵ تۆمار بە ناوی کاتیبی باج کاتیبێك دابمەزرێت، لەم بارەیەوە لەسەر نووسراوی کارگێری گشتی تۆمار و باج ڕەزامەندی دراوە، بە بڕیاری ئەنجوومەنی دارایی لە ژمێریاری گشتی دارایی گفتوگۆی لەسەر کراوە، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری دارایی



BEO.000459.034397.001

| 16 سەفەر 1312 | 000459.034397 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی داد و ویلایەتی موسڵی شکۆدارەکان
لەلایـەن حکوومەتـی کەرکـووك ئاغـای تابـوور ئەرکـی پـێ سـپێردراوە، لـە کاتـی ڕۆیشـتنەکەی ٣٠٠٠٠٠ قـوروش پـارە و کەلوپەلـی تـاڵان کـراوە، هەروەهـا خۆشـی تاوانبـار کـراوە بـە کوشـتنی بـرادەرزادەی خـۆی، بـەم کێشـە و گرفتـەوە بڕیـاری لەسـەر دراوە، بۆیـە لـە ترسـان تـا ئێسـتا لـە سـنووری ئێـران دەسـوڕێتەوە، هـەوڵ دەدات دەوڵەتـی ئێـران بیخاتـە ژێـر پاراسـتنی خۆیـەوە، لەبـەر ئـەوەی زوڵمـی لێکـراوە، وەکـو جـاران لـە شـوێن خـۆی نیشـتەجێ بکرێتـەوە، یاخـود لـە موتەسـەرفیەتی کەرکـووك ئەمنیەتـی نییـە و لەگـەڵ داواکـراوان سـزا دەدرێـت، بـە حەواڵەکردنـی بـۆ دادگای سـلێمانی بـە واژووی بەکـر سـدقی لـە مەرکـەزی سـلێمانی تەلەگرافنامـە بـۆ عەتەبـەی عالـی نێـردراوە، هەرچـی زووە ئـەم کارە جێبەجـێ بکرێـت، جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەت بـە فەرمانـی پاشـا ڕەزامەنـدی داوە، لـە مابەینـی هومایۆنـی بـاش کیتابـەت بـە نـووسراوی تایبەتـی ئـاگاداری نێـردراوە، لـە ویلایەتـی موسـڵی شـکۆدار چۆنیەتـی کارەکـە ئامـاژەی پێکـراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



BEO.000462.034618.001

| 20 سەفەر 1312 | 000462.034618 | BEO |
|---|---|---|

بۆ لایەنی واڵای سەرعەسکەریمان
شـەمەرەکان و هەندێـك گونـد کـە سـەر بـە سـانجەقی کەرکووکـە، لەگـەڵ بەشـێك لـە سـەربازان کاری سـەرپێچی و دزی دەکـەن، لەمانـە بـە نـاوی سـەعید چـاوش لـە ناویـان دەرچـووە و ملکەچـی خـۆی راگەیانـدووە، لـە ویلایەتـی موسـڵی شـکۆدار پـرس کـراوە، لـە وەڵامـدا بـە تەلەگـراف نـووسراو هاتـووە، ئەمجـارە لـە وەڵامـدا تەلەگرافنامـەی مێـژووی ٩ ئۆغسـتۆس ١٣١٠ بـۆ سـیپاهیدار نێـردراوە، لـە ئەندامـی ئەنجوومەنـی کارگێـری جەرجیـس ئەفەنـدی بـۆ شـەمەر نێـردراوە، لەسـەر ئـەم بەڵێنانـەی کـە داویەتـی، ناوبـراو هاتۆتـە کەرکـووك بـە چاوشـی زەبتیـە دامـەزراوە، هەروەهـا لـە ئـاڵای ٣٥ی سـوارە مـاوەی ١٥ سـاڵە چاوشـە و ماوەیەکیـش هاتۆتـە ئـاڵای و چـاوش بـووە، توانـا و ئازایەتـی بینـراوە، لـە کاتـی رێزگرتنـی لـە سلکی ئەفسـەرایەتی لـە چاودێـری کردنـی چەتـەکان کاری باشـی کـردووە، حاڵـی حازریـش لـە بـارەی دەرماڵـەی ئـاڵای لـە فەرمانگـەی دابیـن کـردن رێـك دەخرێـت، بـە پێویسـت زانـراوە لـە مولازمـی زەبتیـەی یەکـەم دابمەزرێـت، بـەم تێروانینـە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت و رابگەیەندرێـت.




BEO.000506.037877.003

| BEO | 000506.037877 | 19 رەبیعی کۆتایی 1312 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز
قەڵەمی تۆمارکردن
تەلەگرافنامەی بە شیفرە لە ویلایەتی موسڵەوە هاتووە

لـە پاشـکۆی کەرکـووك لـە نێـوان بلباسـەکان و هـۆزی ئاکـۆ کـە سـەر بـە قـەزای رانیـەن دوژمنایەتـی کـۆن لـە نێوانیانـدا هەیـە، لەبـەر ئـەوەی کێشـەکە دووبـارە سـەری هەڵدایتـەوە، ئـەو رووبەڕووبوونـەوەی کـە روویـداوە، دامرکێنندرێتـەوە و رێگـە نەدرێـت جارێکـی تـر سـەرهەڵبداتەوە، لـە نزیکتریـن شـوێن کـە قـەزای کـۆی سـانجەقە، لـە سـەربازی شـاهانە تابورێـك بنێردرێتـە شـوێنەکە، لەسـەر ئـەو ئاماژە دووبارەکراوانـەی کـە لـە موتەسـەرفیەتی کەرکووکـەوە دەرچـووە، لـە مێـژووی ٢٩ ئەیلـوول ١٣١٠ و ٦ تشرینـی یەکـەم ١٣١٠ بـە چـوار پارچـە تەلەگـراف نـوسراو بـۆ موشـیرەتی شـکۆداری لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن نووسراوەتـەوە، هەروەهـا تـا هاتنـی فەرمانـی جولـە پێکردنـی سـەربازەکان، بـۆ ئاشـتکردنەوەی نێوانـی ئەمانـە ئامـادەکاری بکرێـت و کاری پێویسـت ئەنجـام بدرێـت، بـۆ ئەنجامدانـی گشـت ئـەم کارانـە لـە وەڵامـدا بـە موتەسـەرفیەتی ناوهاتـوو راگەیەنـدراوە، لەسـەر ئامـاژەی قائیمقامیەتـی خۆچێـی ئێسـتا لـە لیـوای موتەسـەرفیەتی ناوهاتـوو تەلەگرافنامـە هاتـووە و تێیـدا باسـکراوە ئـەو رووبەڕووبوونـەوەی لـە نێـوان هـۆزەکان روویـداوە ٥ تـا ٦ کـوژراو هەیـە و هـۆزی ئاکـۆش لـە سـەرۆکەکانی خۆشـناو خـضر بـەگ و براکـەی بـە نـاوی سـلێمان بـەگ هـاوکاری وەرگرتـووە، بـە گوێـرەی ئـەو زانیاریانـەی هاتـووە باوکـی ئەمانـە بـە نـاوی قـادر بـەگ خۆشـناوەکانی کۆکردۆتـەوە، هەرچـی زووە چارەسـەرێك بـۆ ئەمانـە بدۆزرێتـەوە، بـە راگەیاندنـی پەرەسـەندنی ئـەم تێکچوونـە ئەمجـارە موشـیرەتی ناوهاتـوو بـە تەلەگـراف ئامـاژەی پێکـردووە و رایگەیانـدووە هەرچـی زووە رێگـە لـەم ناکۆکیـە بگیرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش عەبدوڵـڵا پاشا قائیمقامـی هەولێـر بـە پەلـە بـۆ ناوچەکـە بـروات، لـە وەڵامـدا لـە موتەسـەرفیەتی کەرکـووك نووسراوەتـەوە، ئەگەرچـی پێشـووتر لـە نێـوان ئـەم هۆزانـە رووبەڕووبوونـەوە و شـەڕ روویـداوە، بـەڵام هەرچـی زووە پێشـی لـێ بگیرێـت و فەرمانـی بەپەلـە دراوەتـە موشـیری ناوهاتـوو تـا کارەکـە ئەنجـام بدرێـت.
عەزیز والی



| 3 جەمادی کۆتایی 1312 | 000527.039518 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
لـە شـارۆچکەی کـۆی سـانجەقی سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك نیشـتەجێیە و لـە خولەفایەکانـی تەریقەتـی نەقشـبەندی خواڵێخۆشـبوو حاجـی عومـەر ئەفەنـدی زادە حاجـی ئەسـعەد ئەفەنـدی لـەم زانایانەیـە شـایانی میهرەبانیـە، بۆیـە لەسـەر سـەدەقەی جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت مووچەیەکـی گونجـاوی بـۆ ببرێتـەوە، بـۆ ئەمـەش نـووسراوی ویلایەتـی موسـڵ و هاوپێـچ نـووسراوی نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار لـە مێـژووی ٢٦ جەمـادی یەکـەم ١٣١٢ ژمـارە ٣٠٣٧ هاتـووە و بەیەکـەوە بـۆ لای دەوڵـەت نێـردراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



| 27 جەمادی کۆتایی 1312 | 000541.040535 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
لـە شـارۆچکەی کـۆی سـانجەقی نـاو سـانجەقی کەرکـووك نیشـتەجێیە و لـە خولەفایەکانـی تەریقەتـی نەقشـبەندی حاجـی ئەسـعەد ئەفەنـدی شـایەنی میهرەبانیـە، بۆیـە مووچەیەکـی گونجـاوی بـۆ ببرێتـەوە، بـۆ ئەمـەش لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراو نێـردراوە لەگـەڵ نـووسراوی نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار ژمـارە ٥ جەمـادی کۆتایـی ١٣١٢ بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، بەهـۆی پێویسـتی و تەنگانـەوە، ئەمجـارە لەلایـەن ناوبـراوەوە داواکاری پێشـکەش کـراوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە و لەسـەر ئامـاژەی پێشـوو هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.




BEO.000554.041515.002

| BEO | 000554.041515 | 15 رەجەب 1312 |
| --- | --- | --- |

پەیوەندیداری سەدارەت جەنابی سەدری ئەعزەم
داهات و خەرجی سەربازی رەدیف و دەرماڵەی زەبتیەی سانجەقی سلێمانی پاکتاوکراوە، بەڵام ئەوەتا بەش دەکات، هەروەها بۆ پاکتاوکردنی دەرماڵەی شەش مانگی سەربازانی تابووری شاهانەی ئەوێ بۆ ئەوەی نەبێتە دروست بوونی ژاوەژاوی کارگێری ، دابینکردنی دەرماڵەی ئەم شەش مانگەی کە باسکراوە بگوازرێتەوە شوێنێکی تر، لەسەر زانیاری دروست زیادەی شەش مانگێش خراوەتە سەری و بەم بۆنەیەوە گەیشتۆتە ئاستێك بەرگە ناگیرێت، هەروەها سانجەقی کەرکووك و مەرکەزی ویلایەت بارودۆخەکەی خراپ بووە و لە تەلەگرافنامەی مێژووی ١٤ و ٢٢ تشرینی دووەم ١٣١٠ راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە، بۆیە شەش مانگی سەربازی شاهانەی ویلایەت بۆ ویلایەتێکی تر رەوان بکرێت، بەم هەژمارەوە چەند ١٠٠ هەزار قوروشێك بەپەلە دەگاتە جێگەی خۆی لەم بابەتەدا بریار و رای سەرووە، چاوەڕێی فەرمان دەکەم ئەفەندم.
والی موسڵ عەزیز




BEO.000595.044551.005

<table>
<tr><td>BEO</td><td>000595.044551</td><td>7 شەوال 1312</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی تۆمارکردن<br>تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار نێردراوە<br>لــە نێــوان عەشــیرەتەکانی قــەزای رانیــە ســەر بــە ســانجەقی کەرکــووك رووبەرووبوونــەوە و ناکۆکــی روویــداوە، بــۆ ئــەوەی ئــەم ناکۆکیــە بــە رێگــەی هۆزگەرایەتــی و بەرژەوەنــدی گشــتی کارەکــە رێــك بخرێــت، لــە ژێــر ســەرۆکایەتی موتەســەرفیەتی ســانجەقی ناوهاتــوو دەســتەیەك لــە شــێخ و زانــاکان دامــەزراوە و بــۆ دوا جــار بــە پەیوەندیدارانــی وەکالەتمــان راگەیەنــدراوە، یەکــەم ئێــوارە لــە موتەســەرفیەتی ناوهاتــوو تەلەگرافنامــە وەرگیــراوە، لــە نێــوان هەندێــك ئەندامــی عەشــیرەتە ناوهاتــووەکان ئــەو رووبەرووبونــەوەی روویــداوە، لــە هــەردوو لا دوو ســێ کــەس برینــدار بــووە، ئێســتاش لــەو تەلەگرافنامەیــەی کــە وەرگیــراوە، ئامــاژەی پێکــراوە کــە دیــارە لــە نێــوان عەشــیرەتە ناوهاتووەکانــدا دووبــارە رووبەرووبونەوەیەکــی تونــد ســەرهەڵدەدات، بــۆ رێگەگرتــن و روونەدانــی ئــەم رووبەرووبوونــەوە لــەوێ ٢٠٠ ئەنــدام کــە ئامــادەن، لەگــەڵ مەفرەزەیەکــی ســەربازی ناتوانێــت بچێتــە نێــوان ئــەم ٢٠٠٠ کەســە، بــە پەلــە ئامــاژە دراوەتــە خۆچێــی لــەم حاڵەتــە لــە ٢٠ مــارت ١٣١١ لــە وەڵامــی پەیوەندیــداری وەکالــەت تەلەگرافنامــە پێشــکەش کــراوە، بــە تێروانیــن لــەم تەلەگرافنامانــە ئــەو فەرمانــەی کــە دەردەچێــت بــە گرنگــی وەردەگیرێــت، فەرمــان.</td></tr>
</table>




| 18 شەوال 1312 | 000599.044916 | BEO |
|---|---|---|

نووسراو بۆ نەزارەتی دارایی و ویلایەتی موسڵی شکۆدار

ئەم خانە و زەوییانەی کە لە گوندی بنگجە لە ناحیەی توزخورماتو سەر بە سانجەقی کەرکووك لە ژێر بەڕێوەبردنی ئەو دایە، بڕ و نرخەکەی ٤٠٠٠ تا ٥٠٠٠ قوروشە، بەڵام لە کاتی تۆمارکردنی ئەملاکدا ئەم ئەوراقە فەرمیانەی کە لە ژێر دەستییەتی هاوتا و یەکسان نییە، ئەمانە بە ٧٠٠٠٠ قوروش مەزەندە دەکرێت، بەم برەی کە هەیە داوای باج کراوە، بۆیە ئەیوب وەلەدی کۆچەر کەهیا داواکاری بە واژوو و مۆری خۆی ناردووە، تێدا نیشانی داوە زوڵمی لێ کراوە و داوای گۆڕینی کردووە، ئەم داواکاریە بۆ دەوڵەت نێردراوە، چۆنیەتی کارەکەش لە نەزارەتی دارایی شکۆدار باسکراوە، لە ویلایەتی شکۆداریش لێکۆڵینەوە کراوە، بە تێروانین لە دروستی بابەتەکە پێویستە مامەڵەکە جێبەجێ بکرێت، لە نەزارەتی شکۆداریش مامەڵەکە بە پێی پێویست جێبەجێ بکرێت.



| 8 رەبیعی کۆتایی 1312 | 01316.000045 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٩٦٩
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندی
موتەسەرفی سانجەقی موش جەنابی جەلال پاشا بەهۆی کەشوهەوای ناوچەکە ناپرژێتە سەر ئەرکەکەی و ناگونجێت، بۆیە داوای کردووە ئەرکەکەی بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی تر، لەگەڵ موتەسەرفی کەرکووك عارف پاشا ئەرکەکەیان بگۆردرێتەوە، لەم بارەیەوە نووسراوی نەزارەتی ناوخۆی شکۆدار بە هاوپێچەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرموویت جێبەجێ دەکرێت، نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم



Y.MTV.00142.00062.001

| Y.MTV | 00142.00062 | 27 زیلحیجە 1313 |
| --- | --- | --- |

پایەی سەر عەسكەر
قەڵەمی تۆمار
تایبەتی
لـە سـانجەقی كەركـووك لـە نێـوان عەشـیرەتەكانی زەنـد و بالانـی رووبەرووبوونـەوە روویـداوە، بـۆ نەهێشـتنی ئـەم دووبەرەكیـەش سـەربازی شـاهانە رەوان كـراوە، لـە ئەنجـام لـە تاڵانیـەكان دوو شـێخ دەسـتگیر كـراوە، یەكێكیـان رایكـردووە و لـە گوندێـك خـۆی حەشـار داوە، هەروەهـا بوێـری كـردووە چـەك بـەكار بهێنێـت، لـە سـەربازی شـاهانە ٣ كـەس بریـندار بـووە، لـە دانیشـتوانیش ٤ كـەس مـردووە، لـە دانیشـتوانی گوندەكـەش بـۆ ئێـران رایـان كـردووە و شـوێنی خۆیـان بـە جـێ هێشـتووە، جگـە لەمـە بـۆ هێـرش كردنـە سـەر گونـدی دیـدار نزیكـەی ٥٠ تـا ٦٠ كەسـی كۆكردۆتـەوە و مەفرەزەیەكـی ناردۆتـە سـەر گوندەكـە، بـۆ قەدەغەكردنـی خەڵـك لـە چوونیـان بـۆ ئێـران ئامـادەكاری پێویسـت كـراوە، لـە وەكالەتـی ویلایەتـی موسـڵ تەلەگرافنامـە رەوانـی نەزارەتـی ناوەخـۆ كـراوە، ئامـاژەی پێكـراوە كـە ئامـۆژگاری پێویسـت بدرێتـە سـەربازان، نـووسراوی سـەدری ئەعـزەم كـە لـە بابـی عالـی هاتـووە لەگـەڵ جێبەجـێ كردنـی كارەكـە زانیـاری لـە بـارەی شـێخی هەڵاتـوو و زانیـاری تیروتەسـەل نووسراوەتـەوە و بـە موشـیرەتی لەشـكری شەشـەمی هومایۆنـی شـكۆدار كـراوە، ئەمجـارە لـە موشـیرەتی ناوهاتـوو وەڵام هاتـووە، وێنـەی تەلەگرافنامەكـە هاوپێـچ پێشكەشـی عالـی كـراوە و راگەیەنـدراوە، چۆنیەتـی كارەكـەش لـە بابـی عالـی هاتـووە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم كەسـەیە كـە فەرمـان دەردەكات.
رزا سەر عەسكەر





DH.ŞFR.00188.00007.001

| DH.ŞFR | 00188.00007 | 3 ڕەمەزان 1313 |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
توندرەوەکانی شارۆچکەی کۆی سانجەق لە نێوان خەڵك فتنە و ئاژاوە دروست دەکەن، هەروەها بوێری دەکەن شۆرش بەرپا بکەن، ئەگەر دەکرێت چەتە رەسوڵ عەلی ئەحمەد قادر و مەجید ئاغا بهێنرێنە مەرکەزی ویلایەت، بۆ هەموو لایەك دەبێتە جێگەی ووریابوونەوە، لەگەڵ میری ئاڵای مستەفا نافذ بەگ لە هێزی بەدواداچوون گفتوگۆ کراوە لە ئەنجامی ئەو گفتوگۆیە، ئەگەر بە شێوەیەکی گونجاو کارەکە ئەنجام نەدرێت، ئەوا بە هێزی زۆرەملێ رەوانی مەرکەزی ویلایەت بکرێن، بۆ قوماندان و موتەسەرفیەتی کەرکووك نووسراوەتەوە، بە مەبەستی زانیاری راگەیەندراوە، فەرمان.
ساڵح والی موسڵ



BEO.000649.048640.002

| BEO | 000649.048640 | 10 موحەررەم 1313 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی كاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٣٤٤
بۆ پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی
ڕاگەیەندراوی بەندەمانە
شازادە موعینولدەولە لە سەرۆكایەتی گشتی خوی و سەلماس و ڕومیە و ساوجبۆلاق دامەزراوە، هاتۆتە ساوجبۆلاق لەوێش دەچێتە ڕومیە، بۆ پاراستن سانجەقی كەركووك و ئامادەكاری لەسەر سنووری ڕانیە بكرێت، ئەگەرچی ئێستا سەربازانی ئێران هیچ جموجۆڵێكیان نەبینراوە، بەڵام دەبێ پارێزگاری لە سنوور بكرێت، بۆ ئەمەش ئاماژە لە شەهبەندەری ساوجبۆلاق بۆ قائیمقامیەتی ڕواندو نێردراوە، لەم حاڵەتەدا ناردنی سەرباز بە پێویست زانراوە، بە ئاماژەی قائیمقامیەت لە موتەسەرفی كەركووك ئاگاداری دراوە، تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵی شكۆدار بە هاوپێچەوە پێشكەش كراوە، هەر خۆی لەلایەنی سلێمانی و كەركووك لەمەر ئەم بارودۆخەی كە هەیە، هێزی سەربازی زیاد بكرێت، بەڵام لە ویلایەتی موسڵ و موتەسەرفی سلێمانی ئەو گۆڕانكاریەی چاوەڕێ دەكرێت ڕوویدات، ئامادەكاری بكرێت، ئەم هێزەی لەوێ دەبێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو كەسەیە كە فەرمان دەردەكات.
نازری كاروباری ناوەخۆ



| 15 سەفەر 1313 | 000670.050178 | BEO |
|---|---|---|

جەنابی میهرەبانی ئەفەندم
لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووك ناحیەکانـی مەلحـە و کیـل لـە یەکـتر دوورن، لەبـەر ئـەوەی مامەڵـەی باجیـش زۆرە، سـەرەتا رەزامەنـدی دراوە بـۆ ئـەم دوو ناحیەیـە مانگانـە بـە ٣٠٠ قـوروش مووچـە کاتیبێـك دابمەزرێـت، بـەڵام دوای تێروانیـن لـە بابەتەکـە بـە گونجـاو نەزانـراوە، ئەمجـارە لـە ویلایەتـی موسـڵ بـە بـاش زانـراوە مانگانـە هـەر یەکـە بـە ٢٠٠ یـا ١٥٠ قـوروش مووچـەوە بـۆ ناحیەکانـی ناوهاتـوو هـەر یەکـە بـە تەنیـا کاتیبێـك دابمەزرێـت، بـە زیادکردنـی ئـەم ٣٠٠ قوروشـە باسـکراوەش ٢٠٠ قوروشـەکە لـە موازەنـەی گشـتی سـاڵی ١٣١١ پـارەی دەستبەسـەرکراوی فرقەکانـی سـەیارە هەژمـار دەکرێـت، بـۆ پاکتاوکردنـی برەکانـی تۆمارکـراو، حەواڵـەی نەزارەتـی شـکۆدار کـراوە، مەزبەتـەی فەرمانگـەی ناوەخـۆی شـورای دەوڵەتیـش هاوپێـچ راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراو کـراوە ئەفەنـدم.
سەدری ئەعزەم



BEO.000718.053826.001

| BEO | 000718.053826 | 1 رەجەب 1313 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شكۆدار
ئـەم فەرمانبەرانـەی بـۆ هەژماركردنـی سـەرمەڕی سـانجەقی كەركـووك هەڵبژێـردراون پێچەوانـەی نیزامـە، لـە خـزم و كەسـوكار پێـك هاتـووە، بـە گفتوگۆكـردن لەگـەڵ ویلایەتـی موسـڵ و لەسـەر ئـەم نـووسراوەی بـۆ نەزارەتـی دارایـی بەهیـە و دواتـر حەواڵـەی شـورای دەوڵـەت كـراوە، ئـەم مەزبەتەیـەی دراوەتـە فەرمانگـەی ناوەخـۆ، هەڵبژاردنیـان بـە پێچەوانـەی نیـزام دانـراوە، بۆیـە لـە نەزارەتـی ناوهاتـوو ئامـاژە دراوەتـە ویلایـەت تـا فەرمانبەرانی هەژمـاری سـەرمەڕ سـزا بدرێـن، لـە بارەی سـزاكە لـە دەسـتەی ئەنجوومەنـی كارگێری لیـوا ئامـاژە دراوەتـە ویلایەتی ناوهاتـوو و نووسراویـش حەواڵـەی نەزارەتـی ناوهاتـووی شـكۆدار كـراوە، هیممـەت بكرێـت لـە جێبەجـێ كردنـی.


T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞIVI DAIRE BAŞKANLIĞI (BOA)

یلدز سرای همایونی
باش کتابت دائرەسی
٧٩٩١

OSMANLI ARŞİVİ
İ.HUS
51 33
1314.B/64

İ.HUS.00051.00033.001

| 1314 ڕەجەب 26 | 00051.00033 | İ.HUS |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٧٩٩١
لـە سـانجەقی کەرکـووك و لـە دەوروبـەری شـەقامی بەغـداد نیشـتەجێن، ٣٠٠ تـا ٤٠٠ کەسـیان لـە عەشـیرەتی ئۆسـویلی کۆکردۆتـەوە و لەگـەڵ ئەمانـە ئەمنیەتـی ڕێگاکانیـان تێکـداوە، بـەڵام ئەمجـارە ناردنـی هێـزی سـەربازی بـۆ سـەر یەکێـك لـە سـەرۆکەکانی عەشـیرەتی داودە محەمـەد خورشـید و هاوەڵانـی بـاش نییـە، لـە سـەرۆکەکانی عەشـیرەتی ناوهاتـوو ئیسـماعیل بـەگ لـە بەڕێوەبەرایەتـی توزخورماتـو بەڵێنـی داوە کەلوپەلـە تاڵانکـراوەکان بگەڕێنێتـەوە و ڕادەسـت بکاتـەوە و ئاسایشـی ڕێگاکـە جێگیـر بـکات، بۆیـە ناوبـراو دابمەزرێـت، بـەڵام مافـی تـاك و داواکـەی دەمێنێتـەوە، هەروەهـا بـە مەرجـی ڕادەسـت کردنـەوەی کەلوپەلـە تاڵانکـراوەکان بـە تەواوەتـی لـە بەرامبـەر تاوانەکانیـان لـە مافـی گشـتی دەبوردرێـن، لەسـەر تەلەگرافنامـەی ویلایەتـی موسـڵ کـە دەرچـووە، جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا ڕەزامەنـدی نیشـان داوە، لـە وەڵامـدا ئـاگاداری دراوەتـە ویلایەتـی ناوهاتـوو، لـەم بابەتـەدا بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
جەنابی سەرکاتیب



BEO.000796.059669.001

| سەرەتایی موحەررەم 1314 | 000796.059669 | BEO |
|---|---|---|
| جەنابی بە میهرەبانی ئەفەندم<br>لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ قائیمقامـی قـەزای سـەڵاحیەی سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك وەلیەددیـن ئەفەنـدی لـە بەڕێوەبردنـی دە یـەك ناکۆکـی رووی داوە و سـەرپێچی دروسـت بـووە، لەسـەر ئاماژەی ویلایـەت دوور خراوەتەوە و لـە شـوێن ئـەو قائیمقامـی پێشـووی پازارجق محەمـەد ئەلئەیسـەری دامـەزراوە، کە شـارەزایی لـە زمانـی ناوچەکە و خـوی ناوچەکـە هەیـە، ناوبـراو سـوێندی یاسـایی بخوات، بۆ ئەم مەبەسـتە لـە قۆمیسـیۆنی هەڵبژاردنـی فەرمانبەران مەزبەتـە نێـردراوە، لەگـەڵ ئەوراقـی وەرگێرانـی زانیـاری و روون کردنـەوە بەیەکـەوە نێـردراوە، هەروەهـا نـووسراوی هاوپێچـی نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت ئـەو جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراو کـراوە ئەفەنـدم.<br>سەدری ئەعزەم | | |



| 24 سەفەر 1314 | 000821.061524 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دادی شکۆدار لایەنی عالی
بـۆ یاریـدەدەری داواکاری گشـتی مەرکـەزی ویلایەتـی ئەدەنـە یاریـدەدەری داواکاری گشـتی پێشـووی مەرکـەزی وان عاکیـف هەروەهـا بـۆ سـەرۆکایەتی سـزای دادگای سـەرەتایی سـانجەقی حەمـا سـەرۆکی سـزای سـانجەقی کەرکـووك ئەمیـن ئەفەنـدی و بـۆ شـوێنی ئەویـش کاتیبـی حقوقـی فەرمانگـەی زەبتیـەی دادگای ئیسـتیناف و دەرچـووی مەکتەبـی حقوقـی شـاهانە عەلـی ئەفەنـدی و بـۆ یاریـدەدەری داواکاری گشـتی حەمـا یاریـدەدەری داواکاری گشـتی پێشـووی سـانجەقی دەرسـیم وەسـفی ئەفەنـدی و بـۆ یاریـدەدەری داواکاری گشـتی سـانجەقی کەرکـووك و دەرچـووی مەکتەبـی ناوهاتـوو بەهائەددیـن ئەفەنـدی سـوێندی یاسـاییان خـواردووە، لـە بـارەی دامەزراندنیـان لەسـەر راپۆرتـی ١٢ سـەفەر ١٣١٤ ژمـارە ٣٧٨ ی عالـی جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا لـە مێـژووی ٢١ سـەفەری هەمـان سـاڵ رەزامەنـدی نیشـان داوە، کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت.



| BEO | 000836.062645 | 29 ڕەبیعی یەکەم 1314 |
|---|---|---|

بۆ لایەنی عالی نەزارەتی دادی شکۆدار
بـە دوورخسـتنەوەی یاریـدەدەری داواکاری گشـتی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی کەربـەلا حاجـی خەلیـل ئەفەنـدی، لـە دەرچووانـی مەکتەبـی حقوقـی شـاهانە محەمـەد عەلـی ئەفەنـدی و بەهـۆی لێبووردنـی یاریـدەدەری کەرکـووك بەهائەددیـن ئەفەنـدی لـە ئەرکەکـەی، لـە شـوێن ئـەو یاریـدەدەری داواکاری گشـتی پێشـووی سـانجەقی حەمـا ڕاغـب بـەگ سـوێندی یاسـاییان خـواردووە، لـە بـارەی دامەزراندنیـان لەسـەر ڕاپۆرتـی مێـژووی ١٥ ڕەبیعـی یەکـەم ١٣١٤ ژمـارە ٤٤٧ ی عالـی جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا لـە مێـژووی ٢٨ ڕەبیعـی یەکـەم ١٣١٤ ڕەزامەنـدی نیشـان داوە، کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت.



| 14 جەمادی یەکەم 1314 | 000855.064089 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
موتەسـەرفی سـانجەقی کەرکـووك لـە گەرانـەوەی سـەنەدەکاندا پێچەوانـەی راسـتییەکان کاری کـردووە بۆیـە دوورخراوەتـەوە، بەهـۆی سـکاڵاوە تۆمـاری کەوتۆتـە نـاو تۆمـاری زانیارییـەوە، بۆیـە لەلایـەن جەنابـی میـری میـران عەبدولرەحـمان پاشـا داواکاری بـەرز کراوەتـەوە، بـە تێروانیـن لـە کاغـەزی وەرگێـردراوی زانیـاری کـە حەواڵـەی شـورای دەوڵـەت کـراوە، ئـەم ئەرکانـەی کـە پێـی دراوە، هـەر هەمـووی بـە باشـی بەرێـوە بـردووە، لەمانـە وێنـەی گواسـتنەوە و لێبووردنـی لەگـەڵ دەسـت لـە کار کێشـانەوە و مـاوەی ئەرکەکەیـەدا لـە پـارەی میـری و مافـی کەسـێتی بـۆ رۆژێـك بێـت سـەرپێچی نەکـردووە، ئەگەرچـی لـە کاتـی دوورخسـتنەوەی لـە موتەسـەرفیەتی کەرکـووك بەهـۆی گـوێ نەدانـی بـە تێکچوونـی ئاسایشـی ناوچەکـە بـووە، هەروەهـا ئەگەرچـی لایەنگرانـی کـەم بۆتـەوە، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی ئاسایشـی کەرکـووك پارێـزراوە، دوورخسـتنەوەی بـە هـۆکاری زۆرەوە بـووە، بـەم تێروانینـەوە وەکـو جـاران لـە ناوەخـۆ ئەرکـی پـێ بدرێتـەوە، بـە مەزبەتـەی فەرمانگـەی ناوەخـۆ گفتوگـۆی لەسـەر کـرا، لـە تۆمـاری زانیـاری و فەرمانگـەی گشـتی زانیاریـەکان بـە نـووسراو نـاردراوە، هیممـەت بکرێـت.





BEO.000925.069359.002

<table>
<tr><th>BEO</th><th>000925.069359</th><th>6 زیلقەعدە 1314</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە ٤٠٨<br>بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی<br>راگەیەندراوی بەندەیە<br>وەڵامی نووسراوی مێژووی ١٥ مارت ١٣١٣ی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیداری سەدارەتە، موتەسەرفی سانجەقی کەرکووک لەگەڵ موتەسەرفی مەرسین نازم پاشا گۆرینەوەیان پێ کراوە، تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵی عالی بۆ نەزارەتی عاجیزانە رەوان کراوە، بەڵام پاشای ناوهاتوو لەبەر دووری شوێنەکە نیازی نییە بچێتە شوێنەکە و دەست بەکار بێت، لەبەر ئەوەی شوێنەکەی گرنگە و فەرمانبەری بێگانەی زۆرە، لە مەرسین هەڵبگیرێت و ئەم کاتەی جەنابی والی نوێ لێرە بوونی هەبوو، بە هیچ شێوەیەك رازی نەبووە و زیانی بۆ بەرژەوەندی گشتی هەبووە، لە نێوان فەرمانبەران پێشبرکێ دروست بووە، بە ئامادەکاری پێویست موتەسەرفی کەرکووك و وەکیلی قوماندان نێوانیان چاك بکرێتەوە، مامەڵەی ئاسایش و زەبتیە جێگیر بکرێت، ئەم تەلەگرافنامەیەی کە نێردراوە، گەرێندراوەتەوە، بە تێروانین لە بابەتەکە بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>نازری کاروباری ناوەخۆ</td></tr>
</table>



| سەرەتایی موحەررەم 1314 | 01335.000009 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٤
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لە ناو ویلایەتی موسڵ قەزای سەڵاحیەی سەر بە سانجەقی کەرکووك لە نێوان عەشیرەتەکانی قەزای ناوهاتوو ناکۆکی و دووبەرەکی دروست بووە، دەرکەوتووە بۆتە هۆکاری سەرپێچیەکی زۆر، بەمەش قائیمقامی قەزای ناوهاتوو وەلیەددین ئەفەندی بە ئاماژەی ویلایەت دوور خراوەتەوە و لە شوێن ئەو قائیمقامی پێشووی پازارچق محەمەد ئەلئەیسەری کە لە زمان و میزاجی ناوچەکە ئاشنایە، خەریکە سوێند خواردنی جێبەجێ دەکرێت، لە بارەی دامەزراندنیەوە لە قۆمیسیۆنی هەڵبژاردنی فەرمانبەران مەزبەتە نێردراوە، لەگەڵ ئەوراقی وەرگێرانی زانیاری بەیەکەوە نێردراوە، نووسراوی نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار بە هاوپێچەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لەم بابەتەدا جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرموێت ئەو جێبەجێ دەکرێت، بە راگەیاندنی نووسراو کراوە ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم


BEO.001123.084219.001

| 17 زیلحیجه 1315 | 001123.084219 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی و دەفتەرخاقانی شکۆدارەکان
لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ زەوی توزخورماتـو سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك لـە ٦ بەشـی ٥ بەشـی خراوەتـە سـەر ئەملاکـی هومایـۆن، لـە رابـردوو لـە پشـکی سـالم بـەگ یـەك لەسـەر شەشـی بـێ خـاوەن ماوەتـەوە، لـە بەدەلـی موزایـەدەدا بـە ١٥ هـەزار قـوروش کـراوە و خراوەتـە سـەر مولکـی تایبەتـی جەنابـی شاهنشا، زەوی توزخورماتـو و پاشـکۆکانی کـە باسـکراوە بـە گوێـرەی دیـاری کردنـی سـنوورەکەی لەلایـەن حکوومەتـەوە نەخشـەی بەرێوەبـردن و ئیدارەکـەی دراوەتـە خەزینـەی تایبەتـی شـاهانە، بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت جێبەجـێ کردنـی کارەکـە دراوەتـە عالـی، لـە نەزارەتـی خەزینـەی تایبەتـی شـاهانەی بەهیـە ئامـاژەی پێکـراوە و لـە نەزارەتـی ناوهاتـوو لـە وێنـەی دوو پارچـە نەخشـە یەکێکـی نێردراوەتـە نەزارەتـی دەفتەرخاقانـی شـکۆدار ئـەوی تریـش بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



OSMANLI ARŞİVİ
ŞD
2177 | 8 | 1

ŞD.02177.00008.001

| ŞD | 02177.00008 | 8 شەوال 1315 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی دەرەوە
قەڵەمی تۆمار
وێنــەی تــەحریراتــی فەرمانبــەری باڵیــۆزی باڵیۆزخانــەی تەهــران لــە ٨ شــەوال ١٣١٥ و ١٧ شــوبات ١٣١٣ هاتــووە ســەرۆکی عەشــیرەتی خۆشــنوان و دانیشــتوانی کــۆی ســانجەق ســەر بــە ســانجەقی کەرکــووك بــە کوشــتنی براکــەی گومانــی لەســەرە، بۆیــە لەگــەڵ ١٥٠ خانــەی عەشــیرەتەکەی بەیەکــەوە چوونەتــە ئێــران و لــە بانــە نیشــتەجێ بوونــە، ئەمجــارە بەکــر بــەگ داوای کــردووە بگەڕێتــەوە وولاتەکــەی خــۆی، هەروەهــا ئەگــەر لــەوێ بمێنێتــەوە ئــەوا ئاســانکاری دەکات بــۆ ئــەوەی عەشــیرەتەکانی تــری شــاهانەش بــۆ ئێــران کــۆچ بکــەن، هەرچــی زووە جەنابــی شــاهانە بــۆ گەڕانەوەیــان میهرەبانــی بنوێنێــت، بــەڵام لــە هــەر حاڵەتێکــدا جەنابــی پەیوەندیــداری نــەزارەت رای خــۆی رابگەیەنێــت، لــەم بابەتــە بریــار و فەرمــان.


Y.PRK.AZN.00019.00093.001


Y.PRK.AZN.00019.00093.002

| 29 ڕەجەب 1316 | 00019.00093 | Y.PRK.AZN |
|---|---|---|
| لـە ویلایەتـی موسـڵ سـانجەقەکانی کەرکـووک و سـلێمانی هـەم لەگـەڵ ئێـران سـنووره و هـەم لەگـەڵ کوردسـتان، زۆربـەی زۆری دانیشـتوانی ئـەم سـانجەقانە لـە عەشـیرەت و قەبیلـەکان پێـك هاتـووە، هەمیشـە لـە نێوانیـان دووبەرەکـی و ڕووبەڕووبوونـەوە ڕوودەدات، زیـان بـە دانیشـتوانی گونـدەکان دەگەیەنـن، دەسـتیان بـە تـاڵ نییـە، چەندیـن جـار هێرشـیان کردۆتـە سـەر پۆسـتەکان و کاروانەکانـی بەغـداد، لەبـەر ئـەوەی موسـڵ لـە بەغـداد دوورە، ئەگەرچـی لەمەوپێـش ئـەم سـانجەقانە لـە ویلایەتـی بەغـداد جیاکراونەتـەوە و ویلایەتێـك ڕێکخـراوە، هەروەهـا مەرکـەزی ویلایـەت لـە سـنووری ئێـران و ناوەراسـتی شـەقامی بەغـداد شـارۆچکەی کەرکـووك دەسـت نیشـان کـراوە، بـەڵام ماوەیەکـی زۆر تێپەڕیـوە والـی دووەم دامـەزراوە و والـی تەحسـین پاشـا بـە سـەرکەوتوویی لـە مەرکـەزی ویلایـەت بـۆ موسـڵ گوازراوەتـەوە، لـە سـەرەتا و کۆتایـی عەبـدی مەملوکـەکان مـاوەی ٦ تـا ٧ سـاڵ لـە پلانـی عیراقیـە و ویلایەتەکانـی وان و بەتلیـس و هـەکاری لـە پشـکنینی داد بـووم، ئـەوەی مـن بینیـم و پشـکنینم بـۆی کـرد، بـەم تێروانینـە ڕوون بۆتـەوە شـاری موسـڵ لـە گۆشـەیەکی ویلایەتـە، هەروەهـا لـەلای دیاربەکریشـە، لـە خاڵێکـی دووری مەرکـەزە، ڕووداوەکانـی عەشـیرەتەکان و چەتەیـی هەمـوو ئاغاکانـی هەمەوەنـد زیـادی کـردووە، مەرکـەزی ویلایـەت بگەڕێندرێتـەوە کەرکـووك و والیەکیـش لـەوێ دابمەزرێـت کـە لـە زمـان و نەریتـی ناوچەکـە شـارەزایە و دەگونجێـت، ئـەم خاڵانـە لـە بابـی عالـی بـە هەنـد وەرگیـراوە، ناردنـی سـەربازیش بـە پێویسـت زانـراوە، ئاوەدانـی و ئەمنیەتـی پێشـووی بگەڕێندرێتـەوە، جگـە لەمـە پارچەیـەك نەخشـەی ویلایەتـی موسـڵ بـەرز کراوەتـەوە، لـەم بابەتـەدا بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئەفەندیمانـە.<br>محەمەد حوسێنی عەبدی مەملوکەکان لە ئەندامی دادگای عیراق | | |



İ.TAL.00153.00010.007

| İ.TAL | 00153.00010 | 16 ڕەبیعی یەکەم 1316 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
قەڵەمی تۆمار
١٩٥٣
بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
موتەسەرفی پێشووی کەرکووك جەنابی جەمیل پاشا پێش ٢١ ساڵ پلەی بۆ پلەی چوارەم بەرز کراوەتەوە، بەڵام تا ئێستا لەم پلەیە ماوەتەوە، بۆیە پلەکەی بگۆردرێت. بۆ ئەمەش لەلایەن ناوبراوەوە داواکاری بەرز کراوەتەوە، بەهۆی خزمەتەکانی ناوبراو بە تێروانین لە مێژووی بەرزکردنەوەکە لە پلەی دووەم نیشانی مەجیدی پێ بدرێت، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری کاروباری ناوەخۆ




OSMANLI ARŞİVİ
BEC
1252 93864 1

BEO.001252.093864.001

| BEO | 001252.093864 | 21 شەعبان 1316 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
هاوپێچی نووسراوەکانی ١١ و ١٧ شەعبانی ١٣١٦یە، لە نێوان موتەسەرفی سانجەقی کەرکووک و قوماندانی خۆچێی رق و کینە هەیە، ئەم دوژمنایەتیەی نێوانیان زیادی کردووە، ئەم دووبەرەکیەی لە نێوان عەشیرەتەکاندا هەیە رێگریان لێ نەکردوون، بۆ رێگری کردنیش هەردوولا ئامادەکاری پێویستیشیان ئەنجام نەداوە، کەموکوریەکانیان دەست پێ کردووە، بە ئامۆژگاری کردنی هەردوولا کاروبارەکان بەرێوە دەروات، لە موشیرەتی لەشکری شەشەمی هومایۆنی شکۆدار نووسراو کراوە، هاوپێچ بۆ دەوڵەت نێردراوە، لە مێژووی ١٨ شەعبان ١٣١٦ ژمارە ١٧٦٧ نووسراوی سەر عەسکەر کراوە و بە تێروانین لە ئاماژەی پێشوو بە گفتوگۆکردن لەگەڵ ویلایەت هەرچی زووە جێبەجێ بکرێت و ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت، هاوپێچەکانیش رەوان بکرێتەوە.



| 5 شەوال 1316 | 001266.094937 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی بەهیە
هاوپێچی نووسراوی ٣٠ رەمەزان ١٣١٦یە، بۆ دابینکردنی کارگێری سەربازانی شاهانەی کەرکووك ئەوەی قەرز کراوە ٧٠٠٠٠ قوروشە و ئەمەش بەش ناکات، هەروەها ئەگەر مووچەی جەژن نەدرێت، ئەمە رووداوی ناخۆش روو دەدات، بە هەژمارکردنی رسوماتی ئەم ساڵەی مەڕوماڵات کە دێت، لە ئەنجوومەنی کارگێری سانجەق کەرکووك نیشانی داوە، دەبێ هێشتا ١٧٠٠٠٠ قوروش قەرز بکرێت، بە تەلەگراف لە وەکالەتی ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە، گرنگی و بە پەلەیی کارەکەش هەستی پێکراوە، بۆیە بە تەلەگرافنامە داوای مۆڵەت کراوە، لەگەڵ ئەمەش بۆ پاراستنی خەزینەی شکۆدار لە زیان و گرنگیدان بە بابەتەکە، ئامۆژگاری پێویست بدرێت، لە خەزینەی شکۆداریش هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.


٢٩٨٨
i.DH. 1362/1316.L/27
27
3
İ.DH.01362

<table>
<tr><td>İ.DH</td><td>01362.000027</td><td>16 شەوال 1316</td></tr>
<tr><td colspan="3">
بابی عالی<br>
فەرمانگەی سەدارەت<br>
دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>
٢٩٨٨<br>
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>
موتەسـەرفی کەرکـووک جەنابـی بەهـرام پاشـا بەهـۆی لێنەهاتوویـیـەوە تاقمێـك روودا روویـداوە و ئاسـایش تێـك چـووە، بەهـۆی بـەردەوام بوونیـش لەلایـەن بازرگانانـی ناوەخـۆ تەلەگرافنامـە نێـردراوە و داواکاری ئەمانـە دراوەتـە جەنابـی پاشـا، بۆیـە بریـار و فەرمانـی هومایۆنـی جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت دەرچـووە و بـۆ موتەسـەرفی شـوێنی ناوبـراو قائیمقامـی ئەدەپـازار محەمـەد نەزهـەت پاشـا دامـەزراوە، لـە قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە مەزبەتـە دەرچـووە، بـە راگەیانـدن و پێشـکەش کردنـی، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پاشـا بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرموێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتەش نـووسراو کـرا ئەفەنـدم.<br>
سەدری ئەعزەم
</td></tr>
</table>




DH.MKT.02159.00051.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>02159.00051</td><td>29 شەعبان 1316</td></tr>
<tr><td colspan="3">لـەم کاتـەی کـە ئەرکەکـەی لـە کەرکـووك بـۆ سـانجەقی دیوانیـە گواسـتۆتەوە، خەرجـی ڕێگاکـەی زیـاد وەرگیـراوە بۆیـە ١٣ قـوروش و هەندێـك دەگەڕێندرێتـەوە، لـەم بارەیـەوە لەسـەر ئـەم گفتوگۆیانـەی کـە کـراوە لـە کۆتاییـدا داواکاری نامـە نێـردراوە، رووبـەری نێـوان کەرکـووك و دیوانیـە بـە تێروانیـن لـە خشـتە ٨٧ کاتژمێـر دووری نێوانیانـە، لـە ئاماژەی موشـیرەتی لەشـکری شەشـەمی هومایۆنـی شـکۆدار ڕاگەیەنـدراوە، بـەڵام ئـەم رووبـەرەی کـە باسـکراوە بـە هەژمارکردنـی کورتتریـن ڕێـگا لـە ٥٨ کاتژمێـر پێـك دێـت، ئـەم زانیاریـە فەرمیانـەی کـە لـە فەرمانگـەی ئەرکانـی جەنگـی وەرگیـراوە، ١٣٠٠ قـوروش و کسـورەکە ڕادەسـتی نەزارەتـی وەزنـە دەکرێتـەوە، بـە ووتـەی ژمێریـاری لـەم بابەتـەدا ڕاگەیەنـدراوی دووپاتکردنـەوە دەرچـووە.</td></tr>
</table>




DH.MKT.02190.00061.001

| DH.MKT | 02190.00091 | 5 زیلحیجه 1316 |
| --- | --- | --- |

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی

بەڕێوەبەری تەلەگراف و پۆستەی سانجەقی کەرکووك ئەحمەد نەشئەت ئەفەندی بەهۆی خزمەتە باشەکانی و بوێریەوە مووچەکەی گەیشتۆتە ١٠٠٠ قوروش، هەروەها لە بارەی بەرزکردنەوەی پلەکەی بۆ پلەی سێیەم لە پایەی ویلایەتی موسڵ نووسراو وەرگیراوە، هاوپێچەکەشی بۆ بەرزکردنەوەی ناوبراو مووچەکەی ١٠٠ قوروش زیاد دەکرێت و پلەی باسکراویش بە گونجاو زانراوە، بە گفتوگۆ لە پۆستە و تەلەگراف وەڵام هاتووە، لەگەڵ نووسراوی مێژووی ٢٣ مارت ١٣١٥ بەیەکەوە پێشکەشی پەیوەندیداری سەدارەت کراوە، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکە بریار و فەرمان.



İ.AZN.00036.00007.007

| İ.AZN | 00036.00007 | 14 رەجەب 1317 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٠٦٣
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
سـەرۆکی فەرمانگـەی سـزای دادگای سـەرەتایی سـانجەقی کەرکـووك راغـب بـەگ بـە ئامـاژەی ناوەخـۆ روون بۆتـەوە، بـەردەوام بوونـی لـە ئەرکەکـەی گونجـاو نییـە، بۆیـە دوور بخرێتـەوە و لە شـوێن ئـەو سـەرۆکی فەرمانگەی سزای دادگای سـەرەتایی سـانجەقی هـەکاری مسـتەفا نـوری ئەفەنـدی، کـە خـودی خـۆی داوای گۆرینـی شـوێنی ئەرکەکـەی کـردووە، بـۆ شـوێنی ئەویـش یاریـدەدەری داواکاری گشـتی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی بایەزیـد عـارف حیکمـەت ئەفەنـدی و لـە شـوێن ئەویـش لـە دەرچووانـی مەکتەبـی حقوقـی شـاهانە ئیبراهیـم فـەوزی ئەفەنـدی سـوێندی یاسـایی بخـۆن و بگوازرێنـەوە و دابمەزرێـن، بـۆ ئەمـەش نـووسراو کـراوە، لـە ئەنجوومەنـی هەڵبژاردنـی فەرمانبـەران مەزبەتـە رێکخـراوە لەگـەڵ ئەوراقـی روون کردنـەوە بەیەکـەوە نێـردراوە، لـە نەزارەتـی دادی شـکۆداریش راپـۆرت راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت ئـەو جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیانـدنی نـووسراو کـراوە ئەفەنـدم.
سەدری ئەعزەم



| 29 سەفەر 1317 | 001337.100258 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەفتەرخاقانی شکۆدار
لـە نـاو سـانجەقی کەرکـووك لـە زەوییـە خالیەکانـی ناحیـەی مەلحـە بـە خۆرایـی و بەبـێ بەرامبـەر داهاتـی بـەدەل بـە شـێوەی قسـت دەدرێـت، بـرە پـارەی گونجـاو بدرێتـە چـوار نەفـەر بـۆ ئەمـەش لەسـەر هەندێـك ووتـە و داواکاری لەلایـەن سـەرۆکی پێشـووی سـەرۆکی دادگای سـەرەتایی بەغـداد ئەحمـەد ناجـی ئەفەنـدی داواکاری بـەرز کراوەتـەوە و هاوپێـچ دراوەتـە دەوڵـەت، بـە تێروانیـن لـە نیـزام و نەریـت، هیممـەت بکرێـت.



| 6 شەعبان 1317 | 001414.106023 | BEO |
|---|---|---|

نووسراو بۆ نەزارەتی دادی شکۆدار لایەنی عالی
یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی کەرکووك مستەفا نوری ئەفەندی لەگەڵ یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی مونتەفیك عیزەت ئەفەندی بە سوێند خواردنیان ئەرکەکانیان بگۆردرێتەوە، بۆ ئەمەش راپۆرتی ٤ رەجەب ١٣١٧ ژمارە ٥٠٦ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا لە مێژووی ١ شەعبان ١٣١٧ رەزامەندی نیشان داوە، کارەکە جێبەجێ بکرێت.



| 8 زیلحیجە 1317 | 001470.110227 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی خەزینەی تایبەتی شاهانەی بەهیە

لـە سـانجەقی کەرکـووك لـە ٦ بـەش ٥ بەشـی خراوەتـە سـەر ئەملاکـی هومایۆنـی جەنابـی پاشـا، ئـەم زەوییانـەی راگەیەنـدراوە، لـە توزخورماتـو و پاشـکۆکانی راگەیەنـدراوە، لـە کارگێـری حکوومەتـی خۆچێـی چـاو پێخشـاندنەوەی بـۆ کـراوە، لـەم بارەیـەوە لەسـەر نـووسراوی مێـژووی ١٧ شـەوال ١٣١٦ ژمـارە ٤٩ لـە وەڵامـی ئـەم ئاگاداریـەی کـە کـراوە، مامەڵـە رۆیشـتووە، زانیـاری پوخـت لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری ویلایـەت رێکخـراوە و وێنەیەکـی لەگـەڵ دوو پارچـە مەزبەتـەی ئەنجوومەنـی کارگێـری کەرکـووك کـە هاتـووە و نەخشـە و لیسـتەکەی نێـردراوە، سـەرەتا ئـەم لێکۆڵینـەوەی لـە بـارەی ئـەم مەسـەلەیە کـراوە، ئەوراقەکانـی نێردراوەتـە نەزارەتـی بەهیـە و نەزارەتـی دارایـی، لێـرەدا ئـەم قۆمیسـیۆنە تایبەتـەی کـە رێکخـراوە بـە ناردنـی تـا ئێسـتا لـە قۆمیسـیۆن بریارێـك لـە بـارەی چارەسـەرەکە نـەدراوە، بـەم تێگەیشـتنە تەحریراتـی ویلایەتـی موسـڵ بـۆ واڵا نێـردراوە، دوای جێبەجـێ کردنـی هاوپێچـەکان رەوان بکرێتـەوە.



| 1317 زیلحیجه 28 | 001473.110448 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لەسـەر ئەوراقەکانـی لێکۆڵینـەوەی موتەسـەرفی سـانجەقی ماردیـن جەنابـی رائیـف ئەفەنـدی، بـە گوێـرەی ئـەم بریـارەی کـە لـە شـورای دەوڵـەت دراوە مامەڵەکـە جێبەجـێ دەکرێـت، هەروەهـا لەگـەڵ موتەسـەرفی سـانجەقی کەرکـووك جەنابـی محەمـەد نەزهـەت پاشـا ئەرکەکـەی بگۆردرێتـەوە، بـۆ ئەمـەش لەسـەر نـووسراوی مێـژووی ٥ زیلقەعـدە ١٣١٧ ژمـارە ٥٠٦٩ بـە بریـاری قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە لە مێـژووی ١٦ زیلحیجـە ١٣١٧ جەنابی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا رەزامەنـدی نیشـان بـدات، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.




| ŞD | 02181.00032 | 14 رەجەب 1317 |
|---|---|---|

ئەنجوومەنی نەزارەتی دەفتەرخاقانی
ژمارە ۱۰۲
راگەیەندراوی بەندەمانە
ئەحمەد ناجی ئەفەندی سەرۆكی دادگای سەرەتایی پێشووی بەغداد داواكاری بەرز كردۆتەوە و داوای كردووە لە زوییە بەتاڵەكانی ناحیەی مەلحەی سەر بە سانجەقی كەركووك برێكی گونجاوی زوییەكەی بە شێوەی خۆرایی و بەبێ بەرامبەر لە داهاتی بەدەل بە قست بدرێتە چوار كورەكەی، بە نووسراوی سەدری ئەعزەم داواكاریەكە حەواڵەی ئەنجوومەنی نەزارەت كراوە، حەواڵەكردنی زوییە خاڵیەكان بە خۆرایی یاسایی نییە، بە بەدەلی هاوشێوە یاخود بە موزایەدەی قست قەبوڵ بكرێت، ئەمەش لەسەر فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت وەستاوە، هەروەها بە تێروانین لە وێنەی داواكاریەكە جێبەجێ كردنی دەگەڕێتەوە بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو كەسەیە كە فەرمان دەردەكات.
نازری دەفتەرخاقانی




DH.MKT.02221.00058.001

| DH.MKT | 02221.00058 | 5 ره‌بیعی یه‌که‌م 1317 |
|---|---|---|

جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی

ئـاڵای زەبتیـەی ویلایەتـی موسـڵ تابـووری سـانجەقی کەرکـووك ژمێریـاری سـاڵی ١٣١١ و ١٣١٢ سـەرۆکی دەسـتەی پشـکنین بینباشـی عەبدوڵـڵا بـەگ لەگـەڵ ئەندامەکـەی مسـتەفا ئەفەنـدی کـە کاتیبـی ئـاڵای ٣٦ی سـوارەیە، لـە قەڵەمـی ژمێریـاری لیـوای ناوهاتـوو رەفیقـی خەرجـی عەلـی رزا ئەفەنـدی بەهـۆی خزمەتـە رێکوپێکەکانیـان عەبدوڵـڵا بـەگ و مسـتەفا ئەفەنـدی هـەر یەکـە پارچەیـەك مەجیـدی نیشـانی و عەلـی رزا ئەفەنـدی بـە پلـەی چـوارەم رێزیـان لـێ بگیرێـت، سـەبارەت بـە عەبدوڵـڵا بـەگ و مسـتەفا ئەفەنـدی مامەڵەکانیـان حەواڵـە کـراوە، عەلـی رزا ئەفەندیـش نـووسراوی پایـەی واڵای سـەر عەسـکەر لـە ١٥ حوزەیـران ١٣١٥ ژمـارە ٥٨٩ هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.




DH.MKT.02292.00035.001

| DH.MKT | 02292.00035 | 29 شەعبان 1317 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵی عالی

بـۆ چاکسازی و چاککردنـی بارودۆخـە خراپەکـەی نـاو سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی میـری لیوا یوسـف پاشـا ئەرکـی پـێ سـپێردراوە، مەفـرەزەی ناوبـراو سـەرکەوتنی بەدەسـتهێناوە و خۆشـحاڵی راگەیەنـدراوە، سـەبارەت بـە هەندێـك داواکـراوان بـە واژووی جۆراوجـۆر لـە مەرکـەزی کەرکـووك لەلایەنـی واڵای سـپاهیدار دەرچـووە، لەگـەڵ نـووسراوی ٢٧ تشرینـی دووەم ١٣١٥ دوو پارچـە تەلەگرافنامـە پێشکەشـی پەیوەندیـداری سـەدارەت کـراوە و لـەم راپۆرتـەی راگەیەنـدراوە، بـۆ نەهێشـتنی نارەحەتـی ئەوانـەی هـۆکارن لـە رووداوەکان چەنـد کەسـێك دوور بخرێتـەوە، کەلوپەلـە تاڵانکراوەکانیـش رادەسـتی خاوەنەکانیـان بکرێتـەوە، لەسـەر ئـەم تەلەگرافنامەیـەی کـە دراوەتـە پەیوەندیـداری سـەدارەت لەگـەڵ تەلەگرافنامـەی ١٤ تشرینـی دووەم ١٣١٥ چۆنیەتـی کارەکـە بـە تۆمـار روون بۆتـەوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکـە بـە پەلـە لێکۆڵینـەوە ئەنجـام بدرێـت و رابگەیەندرێـت.




ŞD.02702.00042.001

| ŞD | 02702.00042 | 25 شەوال 1317 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٤٩٥٢
بۆ پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی
راگەیەندراوی بەندەیە

ئـەم پۆسـتەیەی هاوپێـچ پێشکەشـی پەیوەندیـداری سـەدارەت کـراوە، سـەبارەت بـە مووچـەی بەرێوەبـەری تۆمـار و قەڵەمـی ئەوراقـی تەحریـرات لەگـەڵ ئەنجوومەنـی کارگێـری سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی و کاتیبـی تەحریراتـی قـەزاکان و بەرێوەبەرەکانـی ناحیـەکان گۆرانـکاری بەسـەر داهاتـووە، بـێ ئـەوەی سـەرپێچی لـە دابینکـراوی کۆنەکـە بکرێـت، لـە فەرمانگـە مێـژووی دەسـتکاری و جێبەجـێ کردنەکـە لـە تێبینـی ئامـاژەی پێکـراوە، بـەڵام دۆسـیەی مووچـەی ناحیەکانـی ئیلغـوارە و زرکـوی، ١١٥٢ قـوروش سـەر لـە نـوێ رێکخـراوە، مووچـەی بەرێوەبـەری ناحیەکانـی سـەرچناری رۆژهـەڵات و رۆژئـاوا دابینکـراوە، جگـە لەمـە کاتیبـی ناحیەکانـی ناوهاتـوو ئـەوەی دەسـت نیشـان کـراوە لـە دەرماڵـەی خەزینـەی شـکۆدار رێکخـراوە، بـە دەفتـەرداری ناوەخـۆش ووتـراوە، بـە پەیوەنـدی کـردن بـە نەزارەتـی دارایـی عالـی ووتـراوە، ١٥٢ قـوروش راگیـراوە، سـەبارەت بـە جێبەجـێ کردنـی تۆمـاری رێکخسـتنی مووچەکانـی ناوهاتـوو و گشـت مامەڵـەکان بـە ووتـەی ژمێریـاری رەزامەنـدی لەسـەر دراوە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
نازری کاروباری ناوەخۆ



İ.DFE.00009.00016.001

| İ.DFE | 00009.00016 | 20 جەمادی یەکەم 1318 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی هومایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٣٩٦٧
راگەیەندراوی بەندەیە
بـە مردنـی موتەسـەرفی پێشـووی بـەسرا سـلێمان بـەگ باوکـی فەریـق میـری میـران جەنابـی محەمـەد شـەوکەت پاشـا بریـکاری سـەرۆکی فەرمانگـەی تاقیکردنـەوە و پشـکنینی تۆپخانـەی عامیـرە، دوو پارچـە زەوی لـە رووبـاری نەهـری قـەزای خۆراسـانی ویلایەتـی بەغـداد و گـردی حوسـێن قولـی سـانجەقی کەرکووکـی ویلایەتـی موسـڵ بـە بەدەلـی ٢٠٠٠٠ قـوروش بـە پاشـای ناوبـراو و باوکـی مـردووی میراتگـر بدرێتـە ئەوانـی تـر، بـۆ ئـەم مەبەسـتە جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا فەرمانـی داوە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
جەنابی سەر کاتیب




| İ.HUS | 00083.00149 | 18رەبیعی کۆتایی 1318 |
|---|---|---|

کۆشکی یڵدزی همایۆن
فەرمانگەی باش کیتابەت
٢٨٢٩
بە مەبەستی پشکنین لە سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی لە لایەنی مولکیە و لە قۆمیسیۆنی پشکنینی سەربازی عالی لە هەر یەکە دوو کەس دامەزرێت، بۆ چوونە شوێنی ئەرکەکەشیان ئەوا بریار و فەرمان دەرچووە، لە لایەنی دەستەی مولکیە یاریدەدەری بەرێوەبەری نامەی ناوەخۆ تۆفیق بەگ و لە موتەسەرفی قەزان نەجیب بەگ کە دوورخراوەتەوە، دامەزرێن، بۆ هەر یەکەیان ٥٠٠٠ قوروش بخرێتە سەر مووچەکەیان هەروەها خەرجی رێگای چوون و هاتنیان بۆ خەرج بکرێت، جگە لەمە مووچەی دوورخراوان کە تایبەت بۆ نەجیب بەگ براوەتەوە، حاڵی حازر وەستێنراوە و دەستی بەسەر داگیراوە، دووبارە رێگە بدرێت پێی بدرێت، لەسەر فەرمانی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیداری سەدارەت لە مێژووی ١١ رەبیعی کۆتایی ١٣١٨ دەرچووە، ئەندامی قۆمیسیۆنی پشکنینی سەربازی عالی میری ئالای وەلی بەگیش دامەزراوە و مووچەی زیادە و خەرجی رێگای پێ دەدرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
جەنابی سەر کاتیب

DH.ŞFR.00256.00012.001

| DH.ŞFR | 00256.00012 | 5 زیلقەعدە 1318 |
|---|---|---|
| خەزینەی تایبەتی شاهانە<br>فەرمانگەی هومایۆنی قەڵەمەکان<br>ژمارە ٤٢٢٦<br>بە عەتەبەی عالیە ڕاگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، هەروەها لە خودی عالی دەست بەسەر کراوە، نووسراوی ئەم بابەتە لە قۆمیسیۆن ڕاگەیەندراوە، لە پاشکۆی ویلایەتی موسڵ قەزای کەرکووک سەر بە سانجەقی شارەزور زەوی بە ناوی تەرجیل ٢٠ بەشی بێ خاوەنە، سەنەدی ١٦ بەشی لەلایەن عالیەوە دەست بەسەرە و بۆ ئەو تەرخان کراوە.<br>سەنەدەکانی فەرمانبەر | | |



| BEO | 001552.116381 | 25 جەمادی یەکەم 1318 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لە بارەی دامەزراندنی موتەسەرفی پێشووی کنج عوسمان بەگ لە موتەسەرفی سانجەقی کەرکووك نووسراوی مێژووی ٢٢ ڕەبیعی کۆتایی ١٣١٨ ژمارە ٢٣٧ بە بڕیاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا لە مێژووی ٢٣ جەمادی یەکەم ١٣١٨ ڕەزامەندی دراوە، وێنەی مەزبەتەی قۆمیسیۆنی ناوبراو هاوپێچ بۆ دەوڵەت ڕەوان کراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




BEO.001564.117281.002

| BEO | 001564.117281 | 16 جەمادی یەکەم 1318 |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی سەدری ئەعزەم

لـە ٢٧ ئۆغسـتۆس ١٣١٦ لـە مەرکـەزی ویلایـەت داهاتـی ئاوقافـی حەرەمـی شـەریف تـا ئێسـتا هیـچ شـتێك خـەرج نەکـراوە، بـە تەواوەتـی نێردراوەتـە دەفتـەرداری بەغـداد، لـە سـندوق لـە سـەر ١٠٠٠ قـوروش و هەندێـك لـە ژمێریـاری ویلایـەت گفتوگـۆ کـراوە و نێـردراوە، لـە سـانجەقی کەرکـووك لـە ساڵی ١٣٠٥ ەوە ئـەم بـرە پارانـەی کـە خـەرج کـراوە، هەرچـی زووە بنێردرێـت و ئامادە بکرێـت، بـە بریـاری پەیوەندیـداری وەکالـەت ئـاگاداری دراوەتـە موتەسـەرفی کەرکـووك، لــە دەفتەرداریــش ئــاگاداری تایبــەت دراوەتــە ژمێریــاری ناوەخــۆ، تــا چەنــد ڕۆژی داهاتــوو کــە گەیشــتمە کەرکـووك چارەسـەرێك دەدۆزمــەوە، ئەنجامەکەشــی دەنێـرم، ڕاگەیەنـدراوە فەرمـان.

والی موسڵ حازم



DH.MKT.02395.00125.001

| کۆتایی ڕەبیعی کۆتایی 1318 | 02395.00125 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی عالی
ژمێریـاری سـانجەقی کەرکـووك عوسـمان ئەفەنـدی و لـە کاتیبەکانـی عاشـق ئەفەنـدی پـارەی میریـان خسـتۆتە سـەر نـاوی خۆیـان، لـەم بابەتـەدا لەسـەر هەندێـك ووتـە ئـەم وەرەقەیـەی کـە لەلایـەن بەڕێوەبـەری تەحریراتـی پێشـووی لیـوای ناوهاتـوو سـاڵح حیلمـی ئەفەنـدی کـە ئەرکەکـەی گوازراوەتـەوە سـانجەقی مونتەفیـك نێـردراوە، وێنەیەکـی بـۆ عالـی ڕەوان کـراوە، بـە تێروانیـن لـە بەراییـەکان ووردبینـی و مامەڵـەی پێویسـت ئەنجـام بدرێـت،



DH.TMIK.M.00116.00017.002

| 8 رەمەزان 1319 | 00116.00017 | DH.TMIK.M |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەتی پایەبەرز
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٢٨٦١
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
عەشیرەتی داوده کە سەر بە سانجەقی کەرکووکە، لە سەرۆکەکەیان محەمەد خورشید ئاغا و براکەی مدحەت ئاغا بەهۆی کارەکانی پێشوویان تکا و پاراونەتەوە، پەشیمانن، لە کۆتاییدا دووبارە و بە پاڵپشتی لێبووردنی عالی دەرچووە، دوای مۆڵەت بۆ ئەوەی جارێکی تر هیچ جموجوڵێکی نابەجێ نەکەنەوە، لە بەغداد کەفیلێکی باوەرپێکراو وەرگیراوە، تکاشیان قەبوڵ کراوە، لە موشیرەتی لەشکری شەشەمی همایۆن راگەیەندراوە، مامەڵەی راوپرس بە نووسراوی سەر عەسکەر لە مێژووی ٢٧ شەعبان ١٣١٩ ژمارە ١٥٥٩ هاوپێچ نێردراوە، بە تێروانین لە بابەتەکە و ئاماژەی خوێندنەوەی دەوڵەت و هاوپێچەکان رەوان بکرێتەوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم



Y.PRK.ASK.00177.00079.001

| Y.PRK.ASK | 00177.00079 | 27 شەعبان 1319 |
|---|---|---|

پایەی سەر عەسکەر
قەڵەمی تۆمار
تایبەتی

لـە پایـەی موشـیرەتی لەشـکری شەشـەمی همایـۆن تەلەگرافنامـە هاتـووە، عەشـیرەتی داودە کـە سـەر بـە سـانجەقی کەرکووکـە، یەکێـك لـە سـەرۆکەکانی ئـەم عەشـیرەتە بـە نـاوی محەمـەد خورشـید ئاغـا و براکـەی مەدحـەت ئاغـا لەسـەر کارە سـەرپێچیەکانی پێشـوویان داوای لێبووردنیـان کـردووە رایانگەیانـدووە کـە پەشـیمان بوونەتـەوە، بۆیـە بـەردەوام سـەردانی لایەنـی پەیوەندیـدار دەکـەن، ئەمجـارە دووبـارە و بـۆ دووپاتکردنـەوە لـە ٧ تشرینـی دووەم ١٣١٧ داوای تکایـان کـردووە، لەگـەڵ ئـەوەی لێبووردنـی عالیـان بـۆ دەرچـووە، بـەڵام دەبـێ کەفیلێـك لـە بەغـداد کەفالەتیـان بـۆ بـکات، هەروەهـا ئـەم دانیشـتوانەی کـە گونـدی خۆیـان بەجـێ هێشـتوە و پەرشـوبڵاوبوونەتەوە، بهێنرێـن و نیشـتەجێ بکرێـن، جگـە لەمـە داهاتـی ناحیەکـە کـە بـە بـەدەل فرۆشـتوویانە دووقاتـی بدرێتـەوە، داهاتـی میریـش کـە لەسـەریانە دەبـێ بیـدەن و ئەوانـەی پاشـکۆی تیروپشـکن و بـە چەتەیـی خەریکـن، دەردەسـت بکرێـن و ئـەم ئـاژەڵ و چەکـی میـری لـە دەسـتیانە رادەسـتی بکەنـەوە و رێـگای نێـوان سـەڵاحیە تـا ناحیـەی تـاوق بپارێـزن و لـە کاتـی خۆیـدا ئـەم کەلوپەلانـەی کـە لەلایـەن چەتەکانـی داودە دزراوە، لەلایـەن حکوومەتـەوە هەژمـار بکرێـت و هەشـت یەکـی لـە تاڵانچیـەکان وەربگیرێتـەوە، بـە تێروانیـن لـە تکایـان رەزامەنـدی لەسـەر دراوە، چۆنیەتیشـی لـە ویلایەتـی موسـڵ ئـاگاداری دراوە، بـەم راگەیەنـدراوە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت، بـۆ گەیاندنـی بـە عالـی راگەیەنـدراوی زانیـاری کراوەتـە نـووسراو، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
رزا سەرعەسکەر


OSMANLI ARŞİVİ
ML.EEM
380 89

ML.EEM.00380.00089.001

| 9 جەمادی یەکەم 1319 | 00380.00089 | ML.EEM |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری دارایی
کارگێری دە یەك و رسوماتی گشتی
ژمارە ٢١١٥

نـاوی گشـتگیری ئەمـلاك و زەوی میـری سـانجەقی کەرکـووك لـە نـووسراوی ژمێریـاری لیـوای ناوهاتـوو لـە مێـژووی ١١ تەممـوز ١٣٠٦ ژمـارە ٤ لەگـەڵ نموونـەی بەراییەکانـی دەفتـەری نێردراو وەکـو یـەك نییـە، بۆیـە مامەڵەکـە تۆمـار نەکـراوە، دەفتەرێکـی تـر رێـك بخرێـت و رەوان بکرێـت، لـە پایـەی پەیوەندیـداری نـەزارەت لـە مێژووەکانـی ٣٠ ئۆغسـتۆس ١٣٠٦ و ١٤ نیسـان ١٣١٣ و ٢٦ کانوونـی یەکـەم ١٣١٤ و ٢٤ ئۆغسـتۆس ١٣١٦ بـە دووپاتکردنـەوە لـە ژمێریـاری ناوهاتـوو نـووسراو کـراوە، بـەڵام هێشـتا دەفتـەری ناوهاتـوو نەهاتـووە، جارێکـی تـر بـە پێویسـت نەزانـراوە دووپـات بکرێتـەوە، لەسـەر ئاماژەی پێشـوو بـە پێویسـت دەزانرێـت پەیوەندیـداری نـەزارەت دووبـارە بـۆ ژمێریـاری ناوهاتـوو نـووسراو بـکات تـا دەفتـەری ناوهاتـوو بـە رێکخـراوی رەوان بکرێـت.



ŞD.00398.00016.001

| ŞD | 00398.00016 | 8 جەمادی یەکەم 1319 |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری دارایی
ژمێریاری گشتی
ژمارە ١٠٥٦
راگەیەندراوی بەندەیە

ئەمرۆ لە ژمێریاری سانجەقی کەرکووك حەسەن ئەنوەر ئەفەندی بوونی هەیە، پێشتر کە لە ژمێریاری سانجەقی عسیر ئەرکەکەی بۆ ژمێریاری کەربەلا گوازتۆتەوە، لەبەر ئەوەی دووری نێوانیان ٩٣٦ کاتژمێر دەبێت، وەکو خەرجی رێگا ٧٠٠٠ و ٣٨ قوروشی پێ دراوە، لەم ووردبینیەی لە بارەیەوە کراوە رووبەری باسکراو مەرکەزی سانجەقی عسیر ئابهادان تا قنق لە قنقیش تا ئەسکەندەرۆن لە ئەسکەندەرۆنیش تا کەربەلا بە ووشکانی و دەریایی ٥٥٨ کاتژمێرە، بەم هەژمارەوە ئەفەندی ناوهاتوو خەرجی رێگاکەی ٤٤٢٠ قوروش دەکات، بەڵام لە دەفتەرداری بەغداد نووسراو نێردراوە، بە تێروانین لە وێنەی ئەم نووسراوانە لە نێوان پلانی یەمەنی و عیراق بە ووشکانی رێگای گەیشتن نییە، لە نێوان کەناراوەکانی یەمەن و کەنداوی بەسرا هەروەها لە نێوان حەدیدە و ئەسکەندەرون بە شێوەیەکی هەمیشەیی پاپۆری پۆستەکان ئامادە نین، بۆیە ناچار بە رێگای عەدەن و کراچی گەشتەکەی ئەنجام بدات، بەم تێگەیشتنە بە پەیوەندی کردن لەگەڵ لایەنی خۆم و سەر عەسکەر نووسراو لە نەزارەتی دەریایی شکۆدار هاتووە، رووبەری رێگای ناوهاتوو تا کەربەلا بە کۆکراوەیی دەکاتە ٨٣٨ کاتژمێر دەکات، بەم راگەیەندراوە و بەم هەژمارەوە ئەو خەرجی رێگایەی کە پێویستە پێی بدرێت، جگە لە سەدا شەش ٦٣٢٠ قوروش دەکات، بۆ ئەوەی رەزامەندی لەسەر ئەم برە پارەیە بدرێت کە زیادەکەی ٧٣٦ قوروشە دەدرێتەوە، خەرجی رێگای ناوبراو بە رێگەی عەدن و کراچی هەژمار کراوە، لەسەر رەزامەندی جەنابی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیداری سەدارەت و بریاری ئەنجوومەنی دارایی لە ژمێریاری گشتی دارایی گفتوگۆی لەسەر کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

نازری دارایی




DH.MKT.00454.00012.001

| DH.MKT | 00454.00012 | 16 زیلقەعدە 1319 |
| --- | --- | --- |

شورای دەوڵەت
هۆبەی پێداچوونەوەی ژمێریاری
ژمارە ٢٥٧
بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەیە

لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ بەرێوەبـەری دارایـی پێشـووی قـەزای هەولێـری سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك حاجـی عەلـی ئەفەنـدی، ئـەم کاتـەی کـە ئەمینـی سـندوقی قـەزای ناوهاتـوودا بـووە کاری نەگونجـاو و سـەرپێچی کـردووە، دادگایـی کردنـی قەدەغـە کـراوە، پەسـەندکردنی بریارنامـە کـە لـە موسـتەنتقی مولکیـەی لیـوای ناوهاتـوو رێکخـراوە، هەروەهـا مەزبەتـەی دەسـتەی تاوانبارانـی ویلایەتـی ناوهاتـوو دەرچـووە، لـە دژی ئـەم مەزبەتەیـە لـە ژمێریـاری لیـوای ناوهاتـوو دەرچـووە، لـە وەڵامـی داواکاری پێداچوونـەوە لـە دادگای پێداچوونـەوەی شـورای دەوڵـەت ئیعـلام رێکخـراوە، هاوپێـچ پێشکەشـی جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەت کـراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکـە و خەرجـی ئیعلامەکـە کـە دەکاتـە ١٠٠ قـوروش رەوانـی سـەرۆکایەتی دادگای ناوهاتـوو بکرێـت، لـە بـارەی ئـاگادار کردنـەوەی ویلایەتـی موسـڵ بریـار و ئامـاژە بدرێتـە نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار و زانیاریـش بدرێتـە نەزارەتـی دارایـی، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.

سەرۆکی شورای دەوڵەت



| 6 رەجەب 1319 | 01391.000003 | İ.DH |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
٢٠٤٣
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
لەسەر ئەم نووسراوەی کە لە نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار حەواڵەی شورای دەوڵەت کراوە، لەگەڵ پۆستەی هاوپێچی فەرمانگەی دارایی رێکخراوە و بەیەکەوە راگەیەندراوە و پێشکەش کراوە، لە مەزبەتەکە سەبارەت بە مووچەی بەرێوەبەری تەحریراتی سانجەقەکانی سلێمانی و کەرکووك و قەڵەمی تەحریراتی ئەوراق و کاتیبەکانی ئەنجوومەنی کارگێری و قەزاکان و بەرێوەبەری ناحیەکانیان لە خۆچێی گۆرانکاری بەسەر کراوە، لە دابینکردنی کۆن سەرپێچی نەکرێت، لە فەرمانگە جێبەجێ کراوە، بەڵام مووچەی بەرێوەبەرەکانی ناحیەکانی ئیلغوار و زرکوی ١٠٠٠٠ و ١٥٢ قوروش هەروەها سەر لە نوێ ناحیەکانی سەرچناری رۆژهەڵات و رۆژئاوا دامەزراوەتەوە مووچەی بەرێوەبەرەکانیان رێکخراوە،تەنیا لە ناحیەکانی ناوبراو نیشان دراوە کە ١٥٢ قوروشی کاتیبەکان وەستێنراوە و لە بارەی رێکخستنی تۆماری مووچەکانی ناوهاتوو ئاگاداری دراوەتە نەزارەتی ناوهاتوو و نەزارەتی دارایی شکۆدار، بە گوێرەی مەزبەتە لە بارەی جێبەجێ کردنی جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا چ بفەرمووێت ئەو جێبەجێ دەکرێت، بەم راگەیاندنە نووسراو کرا ئەفەندم.
سەدری ئەعزەم




BEO.001722.129104.001

| BEO | 001722.129104 | 4 جەمادی یەکەم 1319 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
موتەسەرفی پێشووی سانجەقی کەرکووك عەلی رائیف بەگ ئەفەندی بە ٣٣٧٥ و قائیمقامی پێشووی قەزای ئیلغێن محەمەد عاتف بەگ بە ٤٥٣ قوروش مووچەی دوورخراوانیان بۆ دەبڕێتەوە، بە بڕیاری شورای دەوڵەت جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا ڕەزامەندی نیشان داوە، ناوبراو لە موتەسەرفی شوێنێك و عاتف بەگیش لە قائیمقامیەتی شوێنێك هەڵبژێردرێت، ئەمەش بە نەزارەتی شکۆدار ڕاگەیەندراوە، لە نووسراوەکانی شورای ناوهاتووش باسکراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.



| 12 ڕەبیعی یەکەم 1319 | 02185.00013 | ŞD |
|---|---|---|
| نەزارەتی دەفتەرخاقانی<br>قەڵەمی ئەنجوومەن<br>ژمارە ٣٣<br>بۆ سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>لەسـەر ئـەم سـەرپێچی و سـاختەکاریەی ئەنجامیـان داوە مافـی میـری پێشـێل کـراوە، بـەم هەواڵە لێکۆڵینـەوە کراوە و لەسـەر ئەمـەش ئەوراقەکانـی لێکۆڵینـەوەی بەیـرام ئەفەنـدی فەرمانبـەری دەفتەرخاقانـی سـانجەقی کەرکـووك بەهـۆی ناکۆکـی نێـوان موسـتەنتق و داواکاری گشـتی لیـوای مولکیـە لەلایـەن دەسـتەی تاوانباریەتـی بریاری لەسـەر دراوە، لەگـەڵ نـووسراوی ٢ تشرینـی دووەم ١٣١٦ پێشکەشـی عالـی کـراوە، لـە وەڵامـی ئەم نـووسراوەی کـە لە پایەی ویلایەتـی موسـڵ وەرگیـراوە، نیشـانی داوە و بـەم تێروانینـە هەرچـی زووە بـە گوێـرەی نیـزام کارەکـە ئەنجـام بدرێت و ئەنجامەکەشــی ڕەوانــەی پەیوەندیـداری سـەرۆکایەتی بکرێـت، بـە حەواڵــەش لــە ئەنجوومەنــی نــەزارەت گفتوگـۆی لەسـەر بکرێـت، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.<br>نازری دەفتەرخاقانی | | |



DH.MKT.02586.00083.001

| DH.MKT | 02586.00083 | 2 زیلقەعدە 1319 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
لە بەڕێوەبردن و جێبەجێ کردنی ئەرکەکەی بێ دەسەڵاتە، بۆیە فەرمانبەری ناسنامەی سانجەقی کەرکووك ساڵح ئەفەندی لەم ساڵەدا لە مانگی مارتەوە بە شێوەیەکی کاتی کاری کردووە، کە لە کیتابەتی ناسنامەی ناوەخۆ بووە و سەربازی کردووە، کاری سەرپێچی ڕوویداوە، بۆیە لەشکری چوارەمی هومایۆن نێردراوە، حاڵی حازر رزا ئەفەندی ئەرکەکەی بە وەکالەت بەڕێوەدەبات، هەروەها مامەڵەی ناسنامە بە لایقیەوە جێبەجێ نەکردووە، ١٥٠٠٠ ناسنامە هەر لە ناو کەرکووك ساڵانە بۆ ٩٠ نەفەر کەمی کردووە، هەروەها مامەڵەی سەربازی و مامەڵەی ناسنامە بەیەکەوە نەگونجاو دەبێت و بۆ ئەوەی مامەڵەکە بە باشی بەڕێوە بچێت، یا ئەوەتا بگۆردێت یاخود لەگەڵ یەکێکی تر گۆرینەوەیان پێ بکرێت و بگوازرێتەوە بۆ شوێنێکی تر، بۆ شوێنی ئەویش کەسێکی گونجاو و باش و لێهاتوو دابمەزرێت، بەم ئاماژەی ویلایەتی بەهیە لە موشیرەتی لەشکری شەشەمی هومایۆنی شکۆدار نووسراو وەرگیراوە، تێدا روون کردنەوە راگەیەندراوە، لە نووسراوی سەرعەسکەری عالی ساڵح ئەفەندی فەرمانبەری ناسنامە و کاتیبی ناسنامە ئەمین ئەفەندییە و بۆ رۆژێکیش بێت ئەرکەکە بە ناوی تسعینلی رزا ئەفەندی تۆمار نەکراوە، بە تێروانین لە نووسراوی سەرعەسکەر هەرچی زووە زانیاری لە بارەی رزا ئەفەندی بدرێت ئاخۆ چ کاتێك و لە شوێن کێ دامەزراوە، بە گوێرەی پێویست بە ووتەی کارگێری گشتی تۆماری ناسنامە رادەگەیەندرێت.




DH.TMIK.S.00043.00039.001

| DH.TMIK.S | 00043.000039 | 14 ڕەجەب 1320 |
| --- | --- | --- |

خاخامخانەی دەرسەعادەت و پاشکۆکانی
ژمارە ٩٧
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار لایەنی عالی
ڕاگەیەندراوی داعیەکانە
لـە ناحیـەی توزخورماتـوی سـەر بـە ویلایەتـی موسـڵ جەماعەتـی موسـەوی هـەر لـە کۆنـەوە لـە ژێـر باڵـی جەنابی پاشـا بـە ڕەفاهیـەت و خۆشـی دەژیـن، لـە کۆتاییدا لـە ناحیەی ناوهاتوو لـە لیوای کەرکـووك دابڕێـت و دواتر بخرێتە سـەر قـەزای سـەڵاحیە، بـەم بڕیـارە جەماعەتـی موسـەوییان پشـتگوێ خسـتووە، بەهـۆی ئـەم زوڵمـەی کـە لێیـان کـراوە، لـە بریـکاری خاخـام باشـی داواکاری بـەرز کراوەتـەوە، تەلەگرافنامەکـە وەکـو هاوپێـچ پێشکەشـی جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەت کـراوە، داواکاری بریـکاری ناوبـراو بـە گونجاو بیـنراوە و قەبوڵ کراوە، بۆ ئـەوەی جەماعەتی ناوهاتـوو لـە زوڵـم بپارێزرێـت، لـەم بابەتـەدا بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
مۆری خاخام باشی موسەوی


OSMANLI ARŞİVİ
ML.EEM
418 60

ML.EEM.00418.00060.001

<table>
<tr><td>2 جەمادی کۆتایی 1320</td><td>00418.00060</td><td>ML.EEM</td></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی کاروباری دارایی<br>کارگێری گشتی دەیەك و رسومات<br>ژمارە ٢١٦٩<br>نـاوی گشـت ئەمـلاك و زەوی میـری سـانجەقی کەرکـووك گشـتگیر بـووە، لـە ژمێریـاری لیـوای ناوهاتـوو بـە نـووسراوی ١٢ تەممـوز ١٣٠٦ ژمـارە ٤ نێـردراوە و نموونـەی دەفتـەری بەراییـەکان هاوشـێوەی نییـە و جیـاوازە، بۆیـە لـە رووی کارگێریـەوەش مامەڵـەی تۆمارەکـەی جێبەجـێ نەکـراوە، لـە پارچەیەکـی تـردا دەفتـەری روون کردنـەوە رێکخـراوە و نێـردراوە، لـە پایـەی پەیوەندیـداری نـەزارەت بـە دووپاتکردنـەوە نووسراوەکانـی ٣٠ ئۆغسـتۆس ١٣٠٦ و ١٤ نیسـان ١٣١٣ و ٢٦ کانوونـی یەکـەم ١٣١٤ و ٢٤ ئۆغسـتۆس ١٣١٦ و ٢٥ ئۆغسـتۆس ١٣١٧ لـە نووسراوەکانـی ژمێریـاری ناوهاتـوو باسـکراوە، کەچـی هێشـتا دەفتـەری ناوهاتـوو نەهاتـووە، هەروەهـا لـە بـارەی نۆژەنکردنـەوەی ئەملاکەکانـی ناوهاتـوو لـە بودجـە دوا دەکەوێـت، دواکەوتنـی ئەوراقەکانیـش دەبێتـە هـۆکاری دواکەوتنـی مامەڵەکـە، بۆیـە پێویسـت نـاکات دووپـات بکرێتـەوە، لەسـەر ئامـاژەی پێشـوو دەفتـەری ناوهاتـوو رێـك بخرێـت و هـەر ئێسـتا رەوان بکرێت، پێویسـتە لـە ژمێریاری ناوهاتـوو دووبارە نـووسراوی پەیوەندیـداری نـەزارەت بنێردرێتەوە.<br>بە ناوی قەڵەمی ئەملاك و رسومات</td></tr>
</table>



DH.MKT 545/29
DH.MKT.00545.00029.001

| 18 شەعبان 1320 | 00545.00029 | DH.MKT |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٠٤
نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
بەهــۆی ســکاڵاوە فەرمانبــەری ناســنامەی ســانجەقی کەرکــووك ســاڵح ئەفەنــدی و کاتیبەکــەی رزا ئەفەنــدی لــە ســەرۆکایەتی قەڵەمــی وەرگرتنــی ســەرباز دوورخراونەتــەوە، دواتــر بــە لیســتی بــێ واژوو ســکاڵایان لــە دژی ســەرۆکایەتی ناوهاتــوو بــەرز کردۆتــەوە، خەڵکیــان هــان داوە، بــەم راگەیەنــدراوە دوای لێکۆڵینــەوە کارەکــە جێبەجــێ بکرێــت و ئەنجامەکــەی رابگەیەندرێــت و ئامــاژەی پــێ بکرێــت، لەســەر بریــار و ئامــاژەی جەنابــی پەیوەندیــداری ســەدارەت لــە مێــژووی ٧ تەممــوز ١٣١٨ ژمــارە ٩٠ ئــاگاداری دراوەتــە موتەســەرفی لیــوای ناوهاتــوو، وەڵام بــە تەلەگرافنامــە وەرگیــراوە، لــە لێکۆڵینــەوەی ســکاڵاکانی ســەرۆکی قەڵەمــی وەرگرتنــی ســەرباز میــری لیــوا میــری میــران ئیســماعیل پاشــا لەگــەڵ فەرمانبــەری ناســنامە ســاڵح ئەفەنــدی و کاتیبەکــەی رزا ئەفەنــدی دەرکەوتــووە هیــچ شــتێك نییــە، بــە چــاك کردنــەوەی نێوانیــان ناکۆکــی نێوانیــان و ســاردی نێوانیــان نەمــاوە، بــەم ئامــاژە پێکردنــە بریــار و فەرمــان بــۆ جەنابــی ئــەم کەســەیە کــە فەرمــان دەردەکات.
والی موسڵ نوری


ŞD.01009.00022.002

| 1320 جەمادی کۆتایی 6 | 01009.00022 | ŞD |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقەکانی خانەنشین و دوورخراوانی مولکیە
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٢٣٦١
موتەسەرفی پێشووی سانجەقی کەرکووك عەلی رائیف بەگ مردووە، مونیرە خامی خێزانی و کچەکەی خەدیجە خانم داوایان بەرز کردۆتەوە تا مووچەیان بۆ ببڕێتەوە، سەرەتا لە بارەی مووچەی دوورخراوان کە بۆ کۆچکردوو دابین کرابوو، لە نەزارەتی ناوخۆی شکۆدار خشتەی ماوەی خزمەت و ئەوراقی پەیوەست بەم بابەتە و دەرکەناری هەژمارەکەی کە لە ژمێریاری رێکخراوە، لە دەستەی گشتی ووردبینی بۆ کراوە. لە پۆستەی ناوهاتوو ئەرك و مێژوو و ئەو بڕە مووچەیەی کە ناوبراو وەریگرتووە، هەروەها مێژووی ١ کانوونی دووەم ١٣١٧ کە ناوبراو کۆچی دوایی کردووە، بە بڕیاری فەرمانبەرانی مولکیە مانگانە هەر یەکە ٥٣٦ قوروش مووچە دەکات، ئەگەرچی ناوبراوی مردوو بە ناوی خەیریە خانم خێزانێك و کچێکی تریشی هەیە، بەڵام ناوبراو کچی والی ویلایەتی سیواس حاجی حەسەن پاشا بووە، بۆیە مووچەکەی زیاترە، بە پێویست نەزانراوە مووچەکە بکرێتە دوو بەش، لە بارەی مووچەی بێ خاوەنەکە پشت بەستن بە بڕیارەکانی بریانامەی ناوهاتوو مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت، بۆ دابینکردنی نووسراو بۆ سندوق کراوە، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.



| 5 رەبیعی یەکەم 1320 | 001866.139927 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ئاوقافی هومایۆنی شکۆدار
ئـەم ئـاوەی کـە بـە گونـدی تسـعینی سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك تێدەپەڕێـت، قوماندانـی فرقـەی ڕەدیفـی کەرکـووك فەریـق میـری میـران جەنابـی شـەعبان پاشـا لەگـەڵ میـری لیـوا ئیسـماعیل پاشـا دەسـتی بەسـەر داگیـراوە، سـکاڵا و ڕاگەیانـدن دراوە تـا ڕێگـە بـەم کارە نەدرێـت، لەسـەر نـووسراوی مێـژووی ٢٦ شـەعبان ١٣١٩ ژمارە ٥٤١ ی دەوڵـەت بـە گفتوگـۆ وەڵام لـە لایەنـی والای سەرعەسـکەر وەرگیـراوە، کـە ناوبـراوان بـە هاویـن لـەم شـوێنە دادەنیشـن و چەنـد دارێـك و بـۆ ئاژەڵـەکان برێـك جـۆ دەروێنـن، ئەم ئـاوەی کـە وەك باس دەکرێت دەسـتی بەسـەر داگیـراوە ڕاسـت نییـە، لـە وەڵامـی موشـیرەتی لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن هاتـووە و نـووسراو کـراوە.





BEO.001910.143187.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>001910.143187</td><td>22 جەمادی یەکەم 1320</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ لایەنی والآی سەر عەسکەر<br>ئاغـای تابـووری سـانجەقی کەرکـووك حوسـێن ئاغـا بـۆ ئـەوەی پلەکـەی بـەرز بکرێتـەوە، لـە مێـژووی ١٣ جەمـادی یەکـەم ١٣٢٠ فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت ڕەزامەنـدی دراوە، فەرمانـی عالـی تۆمـار کـراوە و ڕەوان کـراوە، هیممـەت دەکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.</td></tr>
</table>



| 1320 شەعبان 12 | 02723.00059 | ŞD |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٤٦٥٢
جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی
راگەیەندراوی بەندەمانە
لەسەر والی پێشووی موسڵ سکاڵا هەبووە، بۆیە هۆکاری دوورخستنەوەی بە بوهتان و زرانی ناموس هەژمار کردووە، بۆ ئەوەی والی ناوبراو بێ تاوانی خۆی بسەلمێنێت، لەلایەن موتەسەرفی پێشووی سانجەقی کەرکووك میری میران عوسمان پاشا داواکاری پێشکەشی پەیوەندیداری سەدارەت کردووە، لەسەر ئەم بابەتە داواکاری تر دراوەتە نەزارەتی بەندەمان، بە تێروانین لە وێنەی داواکاریەکە داواکراوە کارەکە جێبەجێ بکرێت، هاوپێچ داواکاری ناوبراو رەوانی جەنابی سەدری ئەعزەم کراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری کاروباری ناوەخۆ




BEO.002108.158062.001

| BEO | 002108.158062 | 8 رەبیعی کۆتایی 1321 |
|---|---|---|

بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەریمان
لــە نــاو قــەزای کــۆی ســانجەق بــۆ وەرگرتنــی داهاتــی خەڵکــی بالیســان عەبدوڵــڵا بــەگ و عەبدولرەحــمان بــەگ لەگــەڵ مەفــرەزەی نیزامیــە و فەرمانبــەران نێــردراوە، بــە هیــچ شــێوەیەك ئاســانکاریان بــۆ کارەکانیــان نەکــردووە، لــە بەرامبــەر ســەربازی شــاهانە چەکیــان بــەکار هێنــاوە، یــەك نەفــەر شــەهید بــووە و دوو نەفــەر برینــدار بــووە، یــەك ئێســتریش لەناوچــووە، لەلایەکــی تریــش هاوکاریــان کۆکردۆتــەوە، لەســەر ئــەو زانیاریانــەی کــە بــە موتەســەرفیەتی کەرکــوك راگەیەنــدراوە، مەفرەزەیەکــی تــەواو هــەر ئێســتا رێــك بخرێــت و لەگــەڵ ئەفســەری خۆچێــی بەیەکــەوە بەپەلــە بنێردرێــت تــا ناوبــراوان لەگــەڵ هاوکارەکانیــان بەیەکــەوە بــە زینــدووی یاخــود مردوویــی دەســتگیر بکرێــن، نــووسراو بــۆ موشــیرەتی شــکۆدار و جەنابــی فەریــق موحســین پاشــا نــووسراوە، ئــەوەی بــە ویلایەتــی موســڵ راگەیەنــدراوە لــە نەزارەتــی ناوەخــۆی شــکۆدار ئامــاژەی پــێ کــراوە، بــە راگەیاندنــی ئــاگاداری بەپەلــە بــە فەرمانگــەی ســەربازی شــکۆدار راگەیەنــدراوە.



| 11 رەبیعی کۆتایی 1321 | 002111.158275 | **BEO** |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

بە پشت بەستن بە بریارنامەی بریارەکان موتەسەرفی پێشووی سانجەقی کەرکووك میری میران عوسمان پاشا ٢٢٥٠ مووچەی دوورخراوانی بۆ دابین دەکرێت، لەم بارەیەوە بە بریاری شورای دەولەت جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، کارەکە جێبەجێ کراوە، هەروەها نەزارەتی ناوبراو ئاگادار کراوەتەوە کە ناوبراو لە موتەسەرفیەتێك هەڵبژێردرێت، لە شورای ناوبراو گفتوگۆکراوە و نووسراو کراوە، تا هیممەت بکرێت کارەکە جێبەجێ بکرێت.




BEO.002123.159221.001

| BEO | 002123.159221 | 28 رەبیعی کۆتایی 1321 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
بە مەبەستی دامەزراندنی عوسمان پاشا موتەسەرفی پێشووی سانجەقی کەرکووك لە موتەسەرفیەتی سانجەقی گۆریجە، لەسەر نووسراوی مێژووی ٢٧ رەبیعی یەکەم ١٣٢١ ژمارە ١٩٥٤ بە بڕیاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە بە رەزامەندی ٢٧ رەبیعی کۆتایی ١٣٢١ی فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت وێنەی مەزبەتەی قۆمیسیۆنی ناوهاتوو هاوپێچ بۆ دەوڵەت نێردراوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.

T.C. BAŞBAKANLIK OSMANLI ARŞİVİ DAİRE BAŞKANLIĞI (BOA)

صدارت عظمی مکتوبی قلمی

OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2157 161751

2 vrk
(2 sht boş)

BEO.002157.161751.001

| 4 جەمادی کۆتایی 1321 | 002157.161751 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
بـە تێروانیـن لـە هاوپێچـی نـووسراوی سـەرۆکایەتی شـورای دەوڵەتـی شـکۆدار هەروەهـا پشـت بەسـتن بـە بـارودۆخ و نموونـەی هاوشـێوە لـە نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار مامەڵـە و ئـاگاداری جێبەجـێ بکرێـت.

ڕێگـە نەدرێـت کاتیبـی باجـی پێشـووی قەزای ڕانیە سـەر بە سـانجەقی کەرکـووك فەتـاح ئەفەندی دادگایـی بکرێت.



<table>
<tr><td>1321 رەجەب 21</td><td>002196.164635</td><td>BEO</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆ و دارایی شکۆدار<br>پارەوپولی گشتی سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی بە چ شێوەیەك مامەڵەی لەگەڵ کراوە هەروەها ئەم حاڵە لەلایەن فەرمانبەرانەوە بە خراپی و لە ئیدارەکەیان پێدرێژیان کردووە، لەسەر هەندێك ووتە لە ویلایەتی موسڵ نووسراو لە مێژووی ٢ رەجەب ١٣٢١ ژمارە ٣ دەرچووە، لەگەڵ نووسراوی دارایی بەیەکەوە بۆ دەوڵەت نێردراوە، جگە لەمە ئەو فەرمانبەرانەی کە سکاڵایان لەسەر تۆمار کراوە، ئەمانە کێن و بۆ دەست نیشان کردنیان لە ویلایەتەوە بە گفتوگۆ لێکۆڵینەوە لە بارودۆخی خراپیان کراوە، لەسەر دوورخستنەوە و گۆرینەوەی ئەم فەرمانبەرانە، ئاگاداری دراوەتە نەزارەتی دارایی شکۆدار لە نەزارەتەوەش هەواڵ دراوەتە ویلایەت تا لە دارایی هیممەت بکرێت کارەکە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت، دواتریش هاوپێچەکان بنێردرێتەوە.</td></tr>
</table>



| 26 شەعبان 1321 | 002220.166470 | BEO |
|---|---|---|

نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لـە کەرکـووك تاڵەبانیـەکان و لـە سـلێمانی هەمەوەنـدەکان هـەر لـە کۆنـەوە ئاسـایش و جێگیـری هـەردوو سـانجەقەکەیان تێکـداوە، لەبـەر ئـەوەی چاودێـری ناکرێـن و تەمبـێ نەکـراون، بوێریـان زیـادی کـردووە و ئەگـەر سـەیری ئـەم دوو چەتەیـە بکرێـت، گشـت عەشـیرەتەکان بوێـری گەندەڵیـان کـردووە، لـەم ئاماژانـەی کـە لـە نەزارەتـی شـکۆدار هاتـووە، هەرچـی زووە کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت، تەلەگرافنامـە لـە مێـژووی ٢ تشرینـی دووەم ١٣١٩ ی ویلایەتـی موسـڵی بەهیـە هاوپێـچ بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە ئامـاژەی ویلایەتـی موسـڵ جێبەجـێ بکرێـت و چۆنیەتـی کارەکـە لـە ئەنجوومەنـی تایبەتـی بریـکارەکان خوێندنـەوەی بـۆ بکرێـت، بـە پەلـە رابگەیەندرێـت و هاوپێچـەکان رەوان بکرێتـەوە.



| 1321 شەعبان 29 | 002222.166636 | BEO |
|---|---|---|

لایەنی والآی سەرعەسکەریمان
تاڵەبانیــەکان ئاســایش و ئەمنیەتــی ســانجەقی کەرکووکیــان تێکــداوە، لەبــەر ئــەوەی قوماندانیەتــی فرقــە لــە تەمبــێ کــردن و پەروەردەکردنیــان ســەرکەوتوو نەبــووە، بەمــەش چەتەکانیــان زیــادی کــردووە، لــە کاری کوشــتنی خەڵــك و تاڵانکردنــی پــارە و کەلوپەلــی خەڵــك بەردەوامــن، ئەمنیەتــی ڕێگایــان نەهێشــتووە لەگــەڵ ئەمــەش ئــەم ئــاوەی کــە ناکۆکــی لەســەرە دەســتیان بەســەر داگرتــووە، بۆیــە ناکۆکــی ســەریهەڵداوە، بــۆ ئــەوەی ڕێگــە نەدرێــت شــەڕێکی گــەورە ڕووبــدات و ســەرپێچی ئاســایش کۆتایــی پــێ بێــت، پارێــزگاری لــە ســەرۆکی چەتــەی تاڵەبانــی کــردووە لــە ئەنجامــی پارێــزگاری کــردن و خــۆ بەخــاوەن زانیــن ئەنجامــی هەبــووە، هەرچــی زووە لــە قوماندانــی فرقــەی کەرکــووك و قوماندانــی لیــوای ســلێمانی چاکســازی بکرێــت و لــەم تەلەگرافنامەیــەی کــە لــە ویلایەتــی موســڵ وەرگیــراوە، هاوپێــچ بــۆ لایەنــی ســپاهیدار نێــردراوە، بەراییــەکان ســەرنج ڕاکێــش بــووە، بۆیــە هەرچــی زووە کارەکــە جێبەجــێ بکرێــت و ڕابگەیەندرێــت، هاوپێچەکانیــش ڕەوان بکرێتــەوە.



| BEO | 002225.166836 | 3 رەمەزان 1321 |
|---|---|---|

بۆ لایەنی والی سەر عەسکەریمان
هاوپێچـی نـووسراوی ٢ رەمـەزان ٣٢١، لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سـلێمانی ناکۆکـی و رووبەرووبوونـەوەی عەشـیرەتەکان یـەك لـە دوای یەکـدا روو دەدات، بۆیـە پێویسـت دەکات سـەربازی شاهانە رووبکاتـە ناوچەکـە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە گفتوگـۆ لەگـەڵ موشـیرەتی شـکۆدار کـراوە، لەبـەر ئـەوەی سـەرباز درەنـگ دەگاتـە ناوچەکـە وا دەکات شۆرشـی گـەورە رووبـدات، هەروەهـا ئـەو قوماندانـەی ئەرکـی پـێ سـپێردراوە چاکسـازی بـکات لێبووردنـی گشـتی راگەیانـدووە و جگـە لـە ئاشـتکردنەوەی نێوانیـان هیـچ مامەڵەیەکـی تەمبـێ کـردن ئەنجام نـەدراوە، لەسـەر هەندێـك ووتـە تەلەگرافنامـە لـە ویلایەتـی موسـڵ لـە مێـژووی ٩ تشرینـی دووەم ١٣١٩ بۆ سـەر عەسـکەر نێـردراوە، لەسـەر نووسراوەکانـی تـر و ئاماژەی پێشـوو هەرچـی زووە کارەکـە ئەنجام بدرێـت و هاوپێچەکانـی بنێردرێتـەوە.




İ.DFE.00015.00004.006

| İ.DFE | 00015.00004 | 17 موحەررەم 1322 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی سەدارەت
دیوانی هومایۆنی ئێستا
١٦١
فەرمانبـەری دەفتەرخاقانـی سـانجەقی کەرکـووك بەیـرام ئەفەنـدی بـە هـۆی خواردنـەوە و خـو پێوەگرتنـەوە لـە ئەرکەکـەی بـەردەوام نییـە و بـە باشـی کارەکانـی بەڕێـوە نابـات، بۆیـە دوور بخرێتـەوە و لـە شـوێن ئـەو فەرمانبـەری دەفتەرخاقانـی مەرکـەزی سـانجەقی ویلایەتـی ئیشـقۆدرە محەمـەد ئەسـعەد ئەفەنـدی دابمەزرێـت کـە خـودی خـۆی داوای گواسـتنەوەی ئەرکەکـەی کـردووە، بـۆ ئـەم مەبەسـتە نـووسراوی نەزارەتـی دەفتەرخاقانـی شـکۆدار و مەزبەتـەی قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە ڕێکخـراوە و لەگـەڵ ئەوراقـی وەرگێـردراوی زانیـاری بەیەکـەوە راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـەدا جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا چ بفەرمووێـت جێبەجـێ دەکرێـت، بـە راگەیاندنـی نـووسراو کـراوە ئەفەنـدم.
سەدری ئەعزەم


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BOA)

نظارت امور صحیه

Y.MTV 268/83

Y.MTV.00268.00083.001

| 13 رەمەزان 1322 | 00268.00083 | Y.MTV |
|---|---|---|

نەزارەتی کاروباری تەندروستی
ژووری تەحریرات
سەبارەت بە نەخۆشی کۆلێرا، لە شارۆچکەی حەی سەر بە ویلایەتی بەسرا لە تشرینی یەکەمی رۆژی ٢٥ تا ٢٨ تەنیا ١٠ تووشبوو و ١٠ مردوو هەبووە، هەروەها لە سلێمانی سەر بە ویلایەتی موسڵ لە رۆژی ٢٦ تەنیا ٢ تووشبوو، لە قەزای رانیە سەر بە سانجەقی کەرکووکیش لە رۆژی ٢٧ تا ٢٩ تەنیا ١٩ تووشبوو و ٨ مردوو هەبووە، هەروەها دیر کە مەرکەزی سانجەقی زورە لە مانگی تشرینی دووەم رۆژی ٣ تا ٢٩ تەنیا ٤ تووشبوو و لەوانەش دووانیان مردووە.
نازری تەندروستی






A.}MKT.MHM.00587.00011.002

| 13 جەمادی یەکەم 1322 | 00587.00011 | A.MKT.MHM |
|---|---|---|

تەلەگرافنامە

جەنابی سەدارەت

لـە سـلێمانی نەخۆشـی کۆلێـرا زۆر بـە قورسـی بڵاوبۆتـەوە، هـەر خۆشـی لـە خاکـی ئێـران بـە شـێوەیەکی قـورس بڵاوبۆتـەوە، لـە مـاوەی سـێ سـاڵیش دەبێـت پزیشـکێکی گونجـاو بـۆ بەغـداد نەدۆزراوەتـەوە، بۆیـە فەرمـان دراوە لـە بـەسراش کەسـێك بدۆزرێتـەوە و بنێردرێـت، ئەگەرچـی نەزارەتـی تەندروسـتی ئاگادارکراوەتـەوە، بـەڵام ئاسـاییە کـە لـە بـەسراش نەدۆزراوەتـەوە، لـە نـاو ویلایـەت لەگـەڵ چاودێرێکـی تەندروسـتی لـە کەرکووکیـش تـا رادەیـەك پزیشـکێك دۆزراوەتـەوە، جگـە لـەوە پزیشـکی فەرمانبـەر نییـە بـە پزیشـکی سـەربازی تـا رادەیـەك کێشـەیە، هەروەهـا لـە قـەزای هەولێـر یـەك پزیشـکی شـارەوانی بەپەلـە بنێردرێـت، بریـار و فەرمـان.

والی موسڵ نوری



| 18 سەفەر 1322 | 00847.00076 | DH.MKT |
| --- | --- | --- |

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
بەڕێوەبەری تەحریراتی سانجەقی کەرکووك ئەحمەد حالەت ئەفەندی گونجاو نییە لە کارەکەی بەردەوام بێت، بە دوورخستنەوەی کەسێکی گونجاو لە شوێنەکەی دابمەزرێت، لەسەر نووسراوی مێژووی ٢٨ شوبات ١٣١٩ ژمارە ١٩١ بەڕێوەبەری ئەوراقی ویلایەتی وان ئەحمەد بەگ لە بەڕێوەبەرایەتی تەحریراتی ناوهاتوو دابمەزرێت، لە مێژووی ڕۆیشتنی بۆ شوێنەکەی و دەست بە کار بوونی ناوبراو مانگانە ٩٠٠ قوروش مووچەی بۆ دابین دەکرێت، کارەکەی پێشوو و مووچەی پێشووی وەستێنراوە، هەروەها بە گوێرەی نیزام و سوێندخواردنی و دەست بە کار بوونی لە ئەرکەکەی مێژووی دەست لە کار کێشانەوەی لە ئەرکەکەی پێشووی ڕادەگەیەندرێت، هەروەها لە سەدا ١٥ جگە لە خەرجی ڕێگا ٤٢٩ قوروش و ١٠ پارچە دەکات، لە سەدا ٥ی بۆ سندوق دەڕوات، لە موازەنەی ناوەخۆ خەرجی ڕێگاکە ڕێك دەخرێت و دابین دەکرێت بە ووتەی ژمێریاری ڕادەگەیەندرێت.



DH.MKT.00920.00023.001

| 19 شەوال 1322 | 00920.00023 | DH.MKT |
| --- | --- | --- |

بەڕێوەبەری قەڵەمی فەرمانبەران
٨١٧
مۆڵەتی بەکارهێنانی خراوەتە ژێر بریارەوە، بۆیە بەڕێوەبەری تەحریراتی پێشووی سانجەقی کەرکووک سالح حالەت ئەفەندی داواکاری بەرز کردۆتەوە، بە گوێرەی بابەتی دوورخستنەوەکەی، بەکارهێنانەوەی قەدەغە نییە، بریار لە شورای دەوڵەت وەرگیراوە، لە نووسراوی سەدری ئەعزەم لە مێژووی ٧ کانوونی یەکەم ١٣٢٠ ژمارە ٢٨٨٦ دەرکەوتووە هەروەها ناوبراو ئەوراقی وەرگیراوی کەسێتی لەگەڵ وێنەی پەسەندکراوی نووسراوی سەدری ئەعزەم هاوپێچ پێشکەش کراوە، چۆنیەتی جێبەجێ کردنی کارەکەش لە سەرۆکایەتی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیەی شکۆدار ئاماژەی پێکراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
مۆری بەڕێوەبەری قەڵەمی فەرمانبەران



BEO.002295.172051.001

| BEO | 002295.172051 | 1 موحەررەم 1322 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دادی شکۆدار لایەنی عالی
بـۆ سـەرۆکایەتی فەرمانگـەی حقوقـی دادگای سـەرەتایی ویلایەتـی ئەدەنـە، سـەرۆکی دادگای بازرگانـی مەرکـەزی ویلایەتـی ناوهاتـوو شـاکر ئەفەنـدی هەروەها بۆ شـوێنی یاریدەدەری داواکاری گشـتی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی کەرکـوك رفقـی ئەفەنـدی بـاش کاتیبـی دادگای ئیسـتینافی ویلایەتـی موسـڵ ئیبراهیـم ئەفەنـدی سـوێندی یاسـایی بخـۆن، لـەم بارەیـەوە لەسـەر راپۆرتـی مێـژووی ٨ جەمـادی سـەرەتایی ١٣٢١ ژمـارە ٨٢٢ جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا لە مێژووی ٢٨ جەمـادی یەکـەم ١٣٢١ رەزامەندی نیشـان داوە، کارەکە جێبەجێ بکرێت.



BEO.002307.172976.001

| BEO | 002307.172976 | 18 موحەررەم 1322 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دادی شکۆدار لایەنی عالی

یاریـدەدەری داواکاری گشـتی دادگای سـەرەتایی مەرکـەزی ویلایەتـی بەغـداد ئیسـماعیل ئەفەنـدی لێبـووردراوە، بۆیـە لـە شـوێن ئـەو سـەرۆکی فەرمانگـەی سـزای دادگای سـەرەتایی سـانجەقی کەرکـووك مسـتەفا نـوری و بـۆ سـەرۆکایەتی ناوهاتـووش یاریـدەدەری داواکاری گشـتی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی حەمـا ئیبراهیـم فـەوزی بـۆ شـوێنی ئەویـش حەسـەن لوتفـی ئەفەنـدی کـە لـە سـەرۆکایەتی دادگای بازرگانـی ئەسـکی شـەهیر بـووردراوە، هەروەهـا بـۆ شـوێنی یاریـدەدەری داواکاری گشـتی سـانجەقی دەرسـیم رەمـزی ئەفەنـدی بـاش کاتیبـی دادگای ئیسـتینافی ویلایەتـی ئـەرزروم نەجیـب ئەفەنـدی سـوێندی یاسـایی بخـۆن، لـە بـارەی دامەزراندنیشـیان لەسـەر راپۆرتـی مێـژووی ٧ زیلحیجـە ١٣٢١ ژمـارە ٨١٦ جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا مێـژووی ١٦ موحـەررەم ١٣٢٢ رەزامەنـدی نیشـان داوە.

| 29 موحەرەم 1322 | 002314.173522 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەفتەرخاقانی شکۆدار
فەرمانبـەری دەفتەرخاقانـی سـانجەقی کەرکـووك بەیـرام ئەفەنـدی دوور خراوەتـەوە و لـە شـوێن ئـەو فەرمانبـەری دەفتەرخاقانـی مەرکـەزی سـانجەقی ویلایەتـی ئیشـقۆدرە محەمـەد ئەسـعەد ئەفەنـدی دامەزرێـت، لەسـەر نـووسراوی مێـژووی ٦ زیلحیجـە ١٣٢١ ژمـارە ٣٩٦ ی دەوڵـەت بـە بریـاری قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانـی مولکیـە جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا لـە مێـژووی ٢٧ موحـەرەم ١٣٢٢ ڕەزامەنـدی نیشـان داوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



BEO.002317.173714.003

| BEO | 002317.173714 | سەرەتایی سەفەر 1322 |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
هۆبەی چوارەم
٣٠٦
راگەیەندراوی بەندەیە
موتەسەرفی داهاتووی سانجەقی سلێمانی سالم ئەفەندی تا دەگاتە شوێنی مەبەست و دەست بە ئەرکەکەی دەکات، بە وەکالەت موتەسەرفی لیوای ناوهاتوو بەرێوە ببردرێت، بۆ ئەمەش فەرمان بدرێتە میری رەدیفی لیوا یوسف کەنعان پاشا، هاوپێچ تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵ نێردراوە، بە راگەیەندراوی عالی بۆ جێبەجێ کردن و راگەیاندنی نووسراوی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیداری سەدارەت لە مێژووی ٣ نیسان ١٣٢٠ حەواڵەی فەرمانگەی ئەرکانی جەنگی گشتی کراوە، لە ویلایەتی ناوهاتوو داواکراوە یوسف پاشا رەدیفی لیوای سلێمانی بە وەکالەت لە موتەسەرفی لیوای ناوهاتوو دامەزرێت، ئەگەرچی لە موشیرەتی لەشکری شەشەمی هومایۆنی شکۆدار ئاماژەی پێکراوە، بەڵام لە کاتی خۆیدا پاشای ناوهاتوو لە چاکسازییەکانی سانجەقەکانی سلێمانی و کەرکووک ئەرکی پێ سپێردراوە، بەڵام هیچ کارێکی نەکردووە، هەروەها بۆ ئەوەی ئەم موتەسەرفە وەربگرێت دەستپێشخەری کردووە و پاراوەتەوە، بەڵام وەرگرتنی ئەرکەکە گونجاو نییە، نووسراوی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیداری سەدارەت لە مێژووی ٢١ کانوونی یەکەم ١٣١٩ ژمارە ٢٧٢١ ئاماژەی پێکردووە کەسێکی گونجاوتر دەست نیشان بکرێت و کۆتایی بە کارەکەی ئەویش بهێنرێت، لە وەڵامدا ئاماژە دراوەتە موشیرەتی ناوهاتوو، ئەمجارە بۆ دووپاتکردنەوە نووسراو کراوە، وەڵام و راگەیەندراو و ئاماژەی ناوهاتوو و تەلەگرافنامەی ناوهاتوو هاوپێچ پێشکەش کراوە و دەنێردرێتەوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
رزا سەرعەسکەر



BEO.002387.179001.001

| 28 جەمادی یەکەم 1322 | 002387.179001 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
موتەسەرفی سانجەقی کەرکووك جەمال بەگ بەهۆی کاریگەری کەشوهەوای ناوچەکە نەخۆش کەوتووە، بۆیە داوای کردووە شوێنی ئەرکەکەی بگۆردرێتەوە، لەبەر ئەوەی لێرەش موتەسەرفیەتیەکی کراوە نییە، ئەگەر لە داهاتوو لە موتەسەرفیەتێکی گونجاو هەڵبژێردرێت، حاڵی حازر دوور بخرێتەوە، لە شوێن ئەو قائیمقامی پێشووی ئەنتاکیا مەحمود بەگ دامەزرێت، بۆ ئەمەش لەسەر نووسراوی مێژووی ٥ جەمادی یەکەم ١٣٢٢ ژمارە ٢٢٢٦ی دەوڵەت بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە لە مێژووی ٢٦ جەمادی یەکەم ١٣٢٢ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا رەزامەندی نیشان داوە، هەروەها وێنەی مەزبەتەی قۆمیسیۆنی ناوهاتوو هاوپێچ نێردراوە هیمەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.



BEO.002391.179285.001

| BEO | 002391.179285 | 3 جەمادی کۆتایی 1322 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لـە موتەسـەرفی سـانجەقی کەرکـووك لـە وێنـەی دوورخسـتنەوەی سـەیر کـراوە، مۆڵەتـی بەکارهێنانەوەشـی خراوەتـە ژێـر بریـارەوە، لەلایـەن ئیبراهیـم موخلّیـس بـەگ داواکاری بـەرز کراوەتـەوە، ئەوراقی لێکۆڵینـەوەی ناوبراو نێـردراوە، لـە نووسراوەکانـی ٢٩ ڕەجـەب ١٣٢١ و ٢٦ ڕەبیعـی یەکـەم ١٣٢٢ ژمـارە ٤٣٢١ و ١٦٢٣ حەواڵـە کـراوە، لـە فەرمانگـەی شـورای دەوڵەتیـش مەزبەتـە دراوەتـە قەڵـەم، لـە کۆتاییـدا لەلایـەن ناوبـراو داواکاری بـەرز کراوەتـەوە، بـە تێروانیـن لـە بابەتەکانـی ئەوراقـی لێکۆڵینـەوەی ناوهاتـوو ، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی مامەڵەکـە.


MF.İBT 160/48
MF.İBT.00160

| MF.İBT | 00160.000048 | 1 سەفەر 1323 |
|---|---|---|

ژمارە ١٢
بۆ لایەنی نەزارەتی مەعاریفی گشتی شکۆدار جەنابی پاشا
راگەیەندراوی بەندەیە
عەبدولکەریـم ئەفەنـدی موعەلیمـی مەکتەبـی روشـدیەی قـەزای هەولێـر بەهـۆی نەبوونـی لیاقەتـەوە واتـە لێنەهاتوویـیـەوە، منداڵەکانـی ئەولیـاکان نایانەوێـت بچنـە مەکتەبەکـە، ئەمـڕۆ ئـەم مەکتەبـە وەسـتاوە، ئـەم بارودۆخـە بـە نەزارەتـی شـکۆدار راگەیەنـدراوە و هەواڵـی پـێ دراوە، لـەم بارەیـەوە لێکۆڵینـەوەی پێویسـت ئەنجـام بدرێـت و ئەنجامەکـەی رابگەیەندرێـت، بـۆ ئەمـەش لـە مێـژووی ١٦ کانوونـی یەکـەم ١٣٢٠ ژمـارە ٤٧ داوای بریـار و فەرمـان کـراوە، چۆنیەتـی کارەکـە بـە رێگـەی ویلایەتـی شـکۆدار زانیـاری دراوەتـە موتەسـەرفی کەرکـووك، ئەمجـارە موتەسـەرفیەتی ناوهاتـوو نـووسراو هاتـووە، لـە وەڵامـدا عەبدولکەریـم ئەفەنـدی لێهاتـوو و نـاودارە لـە بـارەی پەروەردەکـردن و فێرکردنـی قوتابیەکانـی زۆر ئەرکـی بینیـوە، ئەگـەر ئـەم جـۆرە هەواڵـە لـە بارەیـەوە ووترابێـت، ئـەوا ئـەم جـۆرە قسـانە بـە مەبەسـت ووتـراوە، لـە وەڵامـی ئـەم ئاگاداریـەی کـە نێـردراوە لـە ئەنجوومەنـی کارگێـری قـەزای هەولێـر مەزبەتـە هاتـووە و ئامـاژە بـەم زانیاریانـە کـراوە، لـە لێکۆڵینەوەکانیـش هەمـان زانیـاری هاتـووە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
بەڕێوەبەری مەعاریفی موسڵ لەگەڵ بەڕێوەبەری مەکتەبی دواناوەندی






DH.ŞFR.00355.00122.001

| DH.ŞFR | 00355.00122 | 18 شەعبان 1323 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شكۆدار
لەگەڵ ئەوەی لە دانیشتوانی سانجەقەكانی كەركووك و سلێمانین هەر چۆنێك بێت ٥ كەسیان هاتۆتە لیوای مونتەفیك بۆ ئەوەی داواكاریەكانی خۆیان جێبەجێ بكەن، میزاجە وەحشیەكەیان دەزانرێت، لە نێوان عەشیرەتەكانی لیوا گەندەڵیان بڵاوكردۆتەوە و دوبەرەكیان خستۆتە نێوانیان، ئاسوودەیی گشتی و ئاسایشی ناوچەكەیان تێك داوە و بۆتە جێگەی هەرەشە، بۆیە پێویستە حكوومەت چاودێری ئەوانە بكات، بە هیچ شێوەیەك گونجاو نییە ئەمانە لە مونتەفیك بمێننەوە، پێویستە رەوانی مەملەكەتی خۆیان بكرێنەوە، ئەمەش لە دەستەی كارگێری خۆچێی بە مەزبەتە راگەیەندراوە، ئەم كەسانە گەرێندراونەتەوە مەملەكەتی خۆیان.
والی و قوماندانی بەسرە فەریق موخلیس




DH.MKT.01005.00004.001

| 10 رەجەب 1323 | 01005.00004 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی

بەڕێوەبەری تەحریراتی سانجەقی کەرکووك محەمەد حیلمی ئەفەندی بەهۆی کارە باشەکانی شایەنی ئەوەیە پلەکەی بەرز بکرێتەوە، بۆ ئەمەش بە پلەی سێیەم بەرز بکرێتەوە، بۆ ئەمەش نووسراو لە ویلایەتی موسڵی بەهیە هاتووە، لەگەڵ هاوپێچی پۆستەی تۆماری بەیەکەوە پێشکەش کراوە، جێبەجێ کردنی رای پەیوەندیداری فەخامەتە.




DH.MKT.01007.00031.002

| DH.MKT | 01007.00031 | 22 شەعبان 1323 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دادی شکۆدار لایەنی عالی
وەڵامی نووسراوی ١٤ ئەیلوول ١٣٢١ ژمارە ١٦٨ عالیە:
خەرجـی نۆژەنکردنـەوەی قۆناغـی حکوومەتـی سـانجەقی کەرکـووك لـە بەشـی نـەزارەت بـووە، لـە پاکتـاو کردنـی برەکـە بـە مەزبەتـەی ویلایەتـی موسـڵ راگەیەنـدراوە، بـەڵام ئەوراقەکانـی دەرخسـتەی نەنێـردراوە، بـە گوێـرەی نیـزام و یاسـا نـووسراو کـراوە بـۆ رێکخسـتن و ناردنـی، هەروەهـا پرسـیار کـراوە ئاخـۆ بـری پارەکـە لـە موازەنـەی ویلایەتـدا بەرامبـەری هەیـە یاخـود نـا، هێشـتا وەڵام نەهاتـووە، هەرچـی خـەرج کردنـی خەرجـی نۆژەنکردنـەوەی قۆناغـی حکوومـەت پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا رەزامەنـدی نیشـان نـەداوە، بـە ووتـەی ژمێریـاری راگەیەنـدراوە.



| 1 رەمەزان 1323 | 01022.00001 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
٢٤ ئەیلوول ١٣٢١ وەڵامی تەلەگرافنامەی پایەی ویلایەتی عالیە، بەرێوەبەری تۆمارکردنی سانجەقی سلێمانی حاجی حەسەن ئەفەندی لەگەڵ بەرێوەبەری تۆمارکردنی کەرکووك نورەددین بەگ گۆرینەوەیان پێ بکرێت، لەگەڵ گەیشتنیان بۆ ئەرکە نوێیەکەیان لە مێژووی دەست بەکار بوونیان مانگانە نورەددین بەگ ١١٠٩ و نیو قوروش و حەسەن ئەفەندی ٩٠٠ قوروش مووچە وەردەگرن، لە بارەی جێبەجێ کردنی بریارەکەی نیزام و سوێند خواردنیان ئەنجام دەدرێت، لەگەڵ دەست بە کاربوونیان مێژووی دەست لە کار کێشانەوە لە ئەرکی پێشوو رادەگەیەندرێت، بە ووتەی ژمێریاری پەلە کراوە لە راگەیاندنی.



| 22 جەمادی کۆتایی 1323 | 002650.198722 | BEO |
|---|---|---|

تەلەگراف بۆ ویلایەتی موسڵ
لە ٩ ئۆغستۆس ١٣٢١ بۆ موتەسەرفیەتی سلێمانی زەکی ئەفەندی بە مەکتوپچی ویلایەت دادەمەزرێت، لەسەر ئەم ئاماژە پێکردنە راگەیەندراو دراوەتە نەزارەتی ناوەخۆ، حاڵی حازر بە وەکالەت کارەکە بەرێوە ببات، رۆیشتنی بۆ سلێمانی گونجاوە.

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لە کۆتاییدا موتەسەرفی سلێمانی سالم پاشا ئەرکەکەی گوازراوەتەوە بۆ موتەسەرفیەتی کەرکووک، هەر ئێستا بە ئاسایی زانراوە بچێتە سەر کارە نوێیەکەی، جگە لەمە تا موتەسەرفێکی تر لە دەرەوە دێت و لە سانجەقی سلێمانی دادەمەزرێت و دەچێتە شوێنەکە، لە ناوەخۆ وەکیلێکی گونجاو نەدۆزرێتەوە، ئەوا مامەڵەی لیوای ناوهاتوو لەوە زیاتر تووشی کێشە دەبێتەوە، لەبەر ئەمە مەکتوپچی ویلایەت حافز زەکی ئەفەندی لە موتەسەرفی لیوای ناوهاتوو دامەزرێت، بە تەلەگرافنامە لە ویلایەتی موسڵی بەهیە راگەیەندراوە، هەروەها تۆماری ناوهاتوو ئێستا بە وەکالەت کارەکە بەرێوە دەبات، بە نووسراو بە ویلایەتی ناوهاتوو رادەگەیەندرێت کە چۆتە سلێمانی، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی کارەکە.



| 20 جەمادی کۆتایی 1323 | 002651.198765 | BEO |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
بـۆ موتەسـەرفی حـوران، موتەسـەرفی پێشـووی کەرکـووك جەمـال بـەگ دامەزرێـت، بـۆ ئەمـەش لـە سـەر نـووسراوی مێـژووی ٢٣ مایـس ١٣٢١ ژمـارە ١٧٢٣ ی دەوڵـەت و مەزبەتـەی قۆمیسـیۆنی فەرمانبـەران جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا لـە مێـژووی ١٩ جەمـادی کۆتایـی ١٣٢٣ ڕەزامەنـدی نیشـان داوە، وێنـەی مەزبەتـەی ناوهاتـوو بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، هیممـەت.


OSMANLI ARŞİVİ
BEO
2681 | 201057 | 1

BEO.002681.201057.001

| BEO | 002681.201057 | 6 شەعبان 1323 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ئاوقافی هومایۆنی شکۆدار
بەڕێوەبـەری ئاوقافـی سـانجەقی کەرکـووك ئەحمـەد فەهمـی ئەفەنـدی بـە بـڕی ٢٠٠ هـەزار قـوروش سـەنەداتی مولتەزیمـی لـەلا بـووە، خواردوویەتـی و سـەرپێچی تێـدا کـردووە و وونـی کـردووە، دوای سـاغ بوونـەوە دراوەتـە دادگا، لـەم کاتـەدا ئەوراقـی لێکۆڵینەوەکانـی هاتۆتـە نەزارەتـی شـکۆدار و بڕیـار لەسـەر بێتاوانـی دراوە، ڕاگەیانـدراوی ڕاسـتەقینە لـە شـێخەکانی نەقشـبەندی ڕەسـول بـە واژووی خـۆی لـە مەرکـەزی موسـڵ تەلەگرافنامـە دەرچـووە، بـۆ دەوڵـەت نێـردراوە، بەرابیەکانیشـی سـەرنج ڕاکێـش بـووە، لـەم بابەتـەدا بـە پەلـە ڕوونکردنـەوە ڕابگەیەندرێـت، هیممەتیـش بکرێـت لـە ناردنـەوەی هاوپێچـەکان.



BEO.002705.202852.001

| 19 رەمەزان 1323 | 002705.202852 | BEO |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شكۆدار<br>بۆ موتەسەرفی سانجەقی ماردین موتەسەرفی سانجەقی كنج میری میران عارف پاشا و بۆ شوێنی ئەویش ئیبراهیم موخلیس بەگ كە لە موتەسەرفی كەركووك دوورخراوەتەوە دابمەزرێن، لەم بارەیەوە لەسەر نووسراوی مێژووی ١٤ رەجەب ١٣٢٣ ژمارە ٢٩٥٩ ی دەوڵەت بە بڕیاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولكیە جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا لە مێژووی ١٨ رەمەزان ١٣٢٣ رەزامەندی نیشان داوە، لەم بارەیەوە وێنەیەكی مەزبەتەی قۆمیسیۆن هاوپێچ نێردراوە، هیممەت بكرێت لە جێبەجێ كردنی. | | |




BEO.002724.204294.002

| BEO | 002724.204294 | 21 شەوال 1323 |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی چوارەم
٢٣٦١
راگەیەندراوی بەندەیە
چوار تابـوری نیزامیـە بـۆ دەوروبـەری سـنووری ئێـران دەنێردرێـت، بـۆ شـوێنی ئـەو چـوار تابـورەش فرقـەی رەدیفـی کەرکـووك لەگـەڵ تابـوری کـۆی سـانجەق و تابـوری یەکەمـی فرقـەی رەدیفـی موسـڵ و تابـوری بەعشـیقە پڕ چـەك دەکرێـن و شـوێنی ئـەوان دەگرنـەوە، بـۆ ئەمـەش بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت ئـاگاداری دراوەتـە قوماندانیەتـی لەشـکری شەشـەمی هومایـۆن، لـە بـارەی جێبەجـێ کردنـی کارەکـە، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
رزا سەر عەسکەر




| BEO | 002725.204337 | 25 شەوال 1323 |
|---|---|---|

تەلەگراف بۆ ویلایەتی موسڵ
بۆ بەدەستهێنانی بەپەلەی داهاتی سانجەقەکانی کەرکووك و سلێمانی تا ئێستا چی کراوە لەگەڵ بری داهاتەکە ئاماژەی پێ بکرێت.



BEO.002734.205027.002

<table>
<tr><td>BEO</td><td>002734.205027</td><td>5 زیلقەعدە 1323</td></tr>
<tr><td colspan="3">فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی<br>یەکەی چوارەم<br>٢٤٧٠<br>راگەیەندراوی بەندەتانە<br>بـۆ پاراسـتنی ئـەو کاروانـەی لـە کەرکووکـەوە بـۆ سـلێمانی دەڕوات، مەفرەزەیەکـی سـوارە لـە چەمچەماڵـەوە ئـەم ئەرکـەی پـێ سـپێردراوە، ئـەو مەفرەزەیـە سـێ کاتژمێـر لـە سـلێمانی دووره لـە شـوێنێك بـە نـاوی تاسـلوجە لەلایــەن عەشــیرەتی مەندەمــی هێرشــیان کراوەتــە ســەر و رووبــەرووی یەکــتر بوونەتــەوە، لــە کاروانەکــە گەشــتیارێك کــوژراوە و لــە ئاژەڵــی میریــش دوو ســەر ئەســپ لــە قاچەکانیــان برینــدار بوونــە، لــە شــوێنی خــۆی راگەیەنــدراوە، لــە فرقــەی قوماندانیەتــی ١٢ ئامــاژەی پێکــراوە، بــۆ تەمبــێ کردنــی عەشــیرەتی ناوبــراو و دەســتگیرکردنی ئـەو بوێرانـەی کـە بـەم کارە هەڵسـاون، هەروەهـا سـێ سـەر ئەسـپیش تەرخـان دەکرێـت، ئەوانـەی ئاسایشـیان تێـك داوە و بـۆ دووبـارە نەبوونـەوەی ئـەو کارانـە هۆکارەکانـی چارەسـەر بکرێـن، بـۆ ویلایەتـی موسـڵ نووسراوەتــەوە، قوماندانیەتــی لەشــکری هومایۆنــی شەشــەم تەلەگرافنامــە هاتــووە و تێــدا نــووسراوە، ویلایەتـی ناوبـراو ئـاگاداری پێویسـتی داوە، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.<br>رزا سەر عەسکەر</td></tr>
</table>






DH.TMIK.M.00229.00045.001

| DH.TMIK.M | 00229.00045 | 7 ڕەجەب 1324 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
شیفرە لە ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە
میـری ئـاڵا مسـتەفا بـەگ لـە دەسـتەی فەرمانبەرانـی لێکۆڵینـەوەی سـنوور، مـاوەی پێنـج شـەش ڕۆژە لەگـەڵ میـری لیـوا عـزەت پاشـا لـە دەسـتەی ناوهاتـوو بەیەکـەوە نەخـۆش کەوتـوون بۆیـە لـە کـۆی سـانجەق ماونەتـەوە، قائیمقـام فوئـاد بەگیـش زیـاد لـە خـۆی نەخۆشـە، لـە ڕانیـە گەڕێندراوەتـەوە کـۆی سـانجەق، تەنیـا نـوری بـەگ لـە دەسـتە جیانەبۆتـەوە، لەسـەر ئامـاژەی موتەسـەرفی کەرکـووك سـالم پاشـا ڕاگەیەنـدراوە فەرمـان.
مستەفا والی




DH.ŞFR.00369.00038.001

| DH.ŞFR | 00369.00038 | 29 جەمادی کۆتایی 1324 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ فەرمانبەرانـی ئێـران چاوپێکەوتـن ئەنجـام بـدەن، لەگـەڵ دەسـتەکەی لـە سەرعەسـکەرەوە چاوەڕێـی وەڵامـی ڕەزامەنـدی دەکـەن، بۆیـە لەگـەڵ دەسـتەکەی بەیەکـەوە گەڕاونەتـەوە کـۆی سـانجەق، لەلایـەن سـالم پاشـا موتەسـەرفی کەرکـووک بـە تەلەگـراف ڕایگەیانـدووە فەرمـان.<br>مستەفا والی | | |




تلغراف نامه



DH.ŞFR.00369.00087.001

| DH.ŞFR | 00369.00087 | 7 رەجەب 1324 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
میری ئالای مستەفا بەگ لەگەڵ دەستەکەی ماوەی پێنج شەش رۆژە وەکو دەستەی لێکۆڵینەوە لەسەر سنوور ئەرکیان پێ سپێردراوە، لەم کاتە لەگەڵ میری لیوا عیزەت پاشا نەخۆش کەوتوون، لە کۆی سانجەق ماونەتەوە، هەروەها قائیمقام فوئاد بەگیش زۆر نەخۆشە، لە رانیە رەوان کراوەتەوە کۆی سانجەق، تەنیا نوری بەگ لە دەستەکە جیانەبۆتەوە، لەسەر ئاماژەی موتەسەرفی کەرکووك سالم پاشا راگەیەندراوە.
مستەفا والی موسڵ



DH.MKT.01071.00019.001



DH.MKT.01071.00019.002

| DH.MKT | 01071.00019 | 9 سەفەر 1324 |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی
یەکەی چوارەم
١٦٦
راگەیەندراوی بەندەیە
لەلایەن فەریقی رەدیف و وەکیلی موتەسـەرف موسا کازم پاشا بە ناهەق دەستبەسـەرکراوە و سووکایەتی پێ کراوە، بۆیـە بـە واژووی وەکیلی قائیمقامی پێشـووی کۆی سـانجەق حەسـەن حوسـنی لە مەرکـەزی کەرکـووک تەلەگرافنامە دەرچـووە، هاوپێـچ پێشـکەش کـراوە، لـەم بارەیـەوە بریـار و فەرمان بـۆ جەنابی ئەو کەسـەیە کە فەرمـان دەردەکات.
رزا سەر عەسکەر

بۆ جەنابی سپاهیداریمان
کۆششـی ٤٠ سـاڵەم بـە هـەدەر رۆیشـتووە، لـە ئەشرافەکانـی کەرکووکـم، موسا کازم پاشا فەریقـی رەدیفـی وەکیلـی موتەسـەرف پێچەوانـەی دادوەری پاشـای تاجـدار بـە ناهەقـی دەستبەسـەری کـردووم و سـوکایەتی جۆراوجـۆرم پـێ دەکات، داوای دادوەری دەکـەم، فەرمـان.
وەکیلی قائیمقامی پێشوو حەسەن حوسنی




DH.MKT.01111.00089.001

<table>
<tr><td>16 جەمادی کۆتایی 1324</td><td>01111.00089</td><td>DH.MKT</td></tr>
<tr><td colspan="3">شورای دەوڵەت<br>دەستەی ژمێریاری<br>ژمارە ٩٦<br>بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت<br>راگەیەندراوی بەندەمانە<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ ناحیەی دیرە حەریری سەر بە سانجەقی کەرکووك لە بارەی بێتاوانی کاتیبی باج یونس ئەفەندی لە ئەنجوومەنی کارگێری ویلایەت لەسەر بریاری پێداچوونەوە لەلایەن ژمێریاری لیوای ناوهاتوو داواکاری پێداچوونەوە بەرز کراوەتەوە و رەت کراوەتەوە، ئیعلامیش لە دادگای پێداچوونەوەی شورای دەوڵەت رێکخراوە و نێردراوە، دواتر بە هاوپێچەوە دراوەتەوە پەیوەندیداری سەدارەت جێبەجێ کردن و خەرجی ئیعلامەکە ١٠٠ قوروشە، لەلایەن یونس ئەفەندی وەربگیرێت و رەوانی شورای دەوڵەت بکرێت، لە بارەی ئاماژەی ویلایەتی ناوهاتوو حەواڵەی نەزارەتی ناوخۆی شکۆدار کراوە، هەروەها لەگەڵ سەرۆکایەتی قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیەی شکۆدار لە بارەی داواکاری کەسێتی زانیاری بدرێتە نەزارەتی دارایی، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>سەرۆکی شورای دەوڵەت</td></tr>
</table>


صدارت عظمی مکتوبی قلمی

نومرو ۱٤۹

داخلیه نظارت جلیله‌سنه

شورای دولت ریاست جلیله‌سنك تذکرهٔ مبعوثه‌سی واصول واقتضاسنه توفیقاً
داخلیه نظارت جلیله‌سنده ایجاب ایدن معامله‌نك و تبلیغاتك ایفاسیله
نتیجه‌سنك علم و اعلامنه همت



BEO.002443.183203.001

| BEO | 002443.183203 | 24 شەعبان 1322 |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

لە بارەی دادگایی کردنی فەرمانبەری مەڕوماڵات ئەحمەد ئەفەندی و کاتیبەکەی محەمەد ئەفەندی و تەحسیلدار عومەر ئەفەندی.




<table dir="rtl">
<tr><td>BEO</td><td>002807.210497</td><td>21 سەفەر 1324</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>موتەسـەرفی پێشـووی سـانجەقی کەرکـووك جەنابـی بەهـرام پاشـا بەهـۆی نەخۆشـیەکەیەوە مانگانـە ١١٢٥ قـوروش مووچـەی خانەنشـینی بـۆ ببڕێتەوە، بـۆ ئەم مەبەسـتەش بە بڕیاری شـورای دەوڵـەت جەنابـی پەیوەندیداری خەلافـەت بـە فەرمانی پاشـا ڕەزامەندی نیشـان بـدات، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکـە دوای ڕاگەیاندنی نـووسراو بکرێت.</td></tr>
</table>




BEO.002846.213402.002

| BEO | 002846.213402 | 13 ڕەبیعی کۆتایی 1324 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٣٤١
بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت لایەنی عالی
ڕاگەیەندراوی بەندەیە

قائیمقامی هەولێر مستەفا پاشا بە وەکالەت لە موتەسەرفی سانجەقی کەرکووك دامەزراوە، داوای کردووە ٥ مووچەی پێ بدرێت، هەروەها ناکرێت ماوەی دووروودرێژی وەکالەتەکەی بە بێ مووچە ئەنجام بدات، خەریکە کاروباری لیواکە پەکی دەکەوێت، لە تەلەگرافنامەی ویلایەتی موسڵ وەرگیراوە و ئاماژەی پێکراوە کە وەکیلی ناوبراو ٥ مووچەکەی پێ بدرێت، کاتی خۆی فرقەی ڕەدیفی کەرکووك قوماندان فەریق میری میران جەنابی کازم پاشا لە موتەسەرفیەتی ناوهاتوو بە وەکالەت دامەزرابوو، ئەم ماوەی بە وەکالەت بوو، ڕۆژانی خالی هەیە، بۆیە لەم ڕۆژانە ٥ مووچەکەی پێ بدرێت، لەم بابەتەدا نووسراوی سەدری ئەعزەمی پەیوەندیداری سەدارەت لە مێژووی ١٢ نیسان ١٣٢٢ ژمارە ٥٩٢ دەرچووە، بە تێڕوانین لە وێنەی ئاماژەکە بە ووتەی ژمێریاری چۆنیەتی مۆڵەت دانەکە ئاماژەی پێکراوە، لەم بابەتەدا بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری کاروباری ناوەخۆ



DH.TMIK.S.00071.00035.001

| 17 زیلحیجە 1325 | 00071.00035 | DH.TMIK.S |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
لە ناو سێ ویلایەت بێ دەنگی زیادی کردووە و ماوەیەکی زۆرە هێڵی تەلەگراف پچراوە، نۆژەنکردنەوەی ئەو هێڵانە دەستی پێکردووە، لە مێژووی ٦ کانوونی دووەم ١٣٢٣ لەگەڵ تەلەگرافنامەی بەندە راگەیەندراوە و ئاماژەی پێکراوە، لە دەورووبەری سلێمانی بە زەبری چەك دەستیان پێ کردووە، هەروەها ماوەیەکی زۆرە لەلایەن کوردەکان و عەشیرەتەکانەوە وێران کردن و پچرانی هێڵی تەلەگرافی نێوان سلێمانی و بازیان هەروەها لە نێوان چەمچەماڵ و کەرکووك لەگەڵ مەخمور و هەولێر ئەنجام دراوە، بۆیە دەست بە چاککردنەوەی هێڵەکان کراوە، بۆ ئەمەش پێویستە کەمتەرخەمی نەکرێت و پێویستە نزا بۆ هومایۆن بکرێت تەمەن درێژ و سەلامەت بێت، بەم شێوەیە دووبارە نزا کراوەتەوە، ئەو نووسراوەی کە لە باش مودیریەتی پۆستە و تەلەگرافی بەغداد وەرگیراوە، راگەیەندراوە بە راگەیاندنی زانیاریەکان بوێری کراوە، فەرمان.
نازم سەرۆك چاککردنەوەی دەستەی هێڵی عیراق




İ.HUS.00160.00017.001

<table>
<tr><th>İ.HUS</th><th>00160.00017</th><th>7 شەوال 1325</th></tr>
<tr><td colspan="3">کۆشکی یڵدزی هومایۆن<br>فەرمانگەی باش کیتابەت<br>٦٣٥٠<br>باش کاتیبی دادگای سەرەتایی سانجەقی کەرکووك سەید عەلی ئەفەندی بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت فەرمان دراوە لە ناو ویلایەتی موسڵ لە قائیمقامیەتی قەزایەك دابمەزرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>جەنابی سەرکاتیب</td></tr>
</table>



| 17 رەبیعی کۆتایی 1325 | 00245.00010 | DH.TMIK.M |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی عالی
لـە سـانجەقی سـلێمانی مـاوەی ٥٠ سـاڵە بـە تاپـۆ خاوەندارێتـی ئـەو زەوی و زارە دەكات، بـەڵام بـۆ ڕێگـە گرتـن لـەو سـەرپێچیانەی کـە دەكرێـت و ئەو هۆكارانە هەڵگیرێن کە دەبنە هـۆكاری ئەم كارە لەلایـەن بەرێوەبەری تۆماركردنی سـانجەقی كەركـووك حەسـەن ئەفەنـدی داواكاری پێشـكەش كـراوە، بـە ووتـەی قۆمیسـیۆنی مامەڵـەی بەپەلـە بـۆ سـەروو نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە بەراییەكانـی و لـە بابەتەكـە ئـەوا كارەكـە جێبەجـێ بكرێـت و ڕابگەیەندرێـت.



DH.TMIK.M.00257.00019.001



DH.TMIK.M.00257.00019.002

| 21 رەمەزان 1325 | 00257.00019 | DH.TMIK.M |
|---|---|---|

مۆڵەت

لە دەرسەعادەت و لە گیزلی تاش بۆ مەزهەر ئەفەندی لە میوانخانەی رەمزی بەگ

ئـەو تەلەگرافـەی کـە لـە بـارەی دەسـتگیرکردنی بکـوژەکان لـە سـەدارەتی پایەبـەرز بـۆ ویلایەتـی شـکۆداری موتەسـەرفیەتی کەرکـووك بـۆ حکوومەتـی رانیـە هاتـووە، ئـەم فەرمانانـە بـە بریـار و ئەنجـام بـە کەوتـووی ماوەتـەوە، بکـوژەکان لـە ترسـی عەشـیرەتەکەمان چوونەتـە قـەزای حەمیدیـە، دوای بەدواداچـوون حکوومەتـی رانیـە بـۆ ئـەوەی خوێنـی کوڕەکـەم بـە هـەدەر بـڕوات، پارەوپولـی تاڵانکـراوی بـەش کـردووە، دوای ئەمـەش ڕێگایـان نیشـان داون، لـە جیاتـی ئـەوەی بـە گوێـرەی یاسـا مامەڵەیـان لەگـەڵ بکرێـت بـە پێچەوانـەوە پارێـزراون، مـاوەی چـوار مانگـە بـەردەوام سـەردانمان کـردوون بـەڵام بـێ سـوود بـووە، بـە بـێ دەنـگ بـوون زیاتـر لـە ٣٠ سـاڵە لێـی دەربازبوونـە، هەروەهـا خانەکـەم لـە بەغـداد و بازرگانـی و قەرزەکانـم تـەرك کـردووە بـۆ وەرگرتنـەوەی تۆڵـەی خـۆم لـە چوارچێـوەی پاراسـتنی مافەکانـم چوومەتـە نـاو عەشـیرەتەکەم، لـەم بابەتـەدا بەرپرسـیارێتی مـاددی و مەعنـەوی لای حکوومەتـە، راگەیاندنـی پێویسـتە.

مستەفا لە سەرۆکەکانی هۆزی ئاکۆ

بۆ ویلایەتی موسڵی عالی

بـە واژووی سـەرۆکی هـۆزی ئاکـۆ، مستەفا لـە مەرکـەزی کـۆی سـانجەق بـۆ مەزهـەر ئەفەنـدی لـە دەرسـەعادەت تەلەگرافنامـە نێـردراوە، بابەتەکـە جێگـەی ووردبینـی و سـەرنج راکێشـە، وێنـەی تەلەگرافنامـەی مێـژووی ٧ تشرینـی یەکـەم ١٣٢٣ وەرگیـراوە، بـە لێکۆڵینـەوە بەپەلـە ئامـاژەی پێکـراوە و لە قۆمیسـیۆن گفتوگۆی لەسـەر کراوە.

DH.ŞFR.00379.00026.001

| DH.ŞFR | 00379.00026 | 15 ڕەبیعی یەکەم 1325 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
مێــژووی ٨ نیســان ١٣٢٣ هاوپێچــی تەلەگرافــی بەندەمانــە، هەمەوەنــدەکان کــە لــە عەشــیرەتەکانی بازیانــە، لــەم ڕۆژانــە دەســتیان بــە چالاکــی و جموجۆڵــی نەشــیاو کــردووە، بــۆ ســەقامگیری و بەرقەراربوونــی ئاســایش و ئاســوودە بوونــی دانیشــتووان مەفــرەزەکان لــە ســەربازی شــاهانە ڕێــك بخرێــت و بنێردرێــن، بــە ئامــاژەی قائیمقامیــەت، بــە موتەســەرفیەتی کەرکــووك ڕاگەیەنــدراوە، لــەم بارەیــەوە تەلەگرافنامــەی مێــژووی ٢٠ مــارت ١٣٢٣ بەپەلــە جێبەجــێ بکرێــت، فەرمــان.
مستەفا والی موسڵ




DH.MKT.01212.00079.001

| DH.MKT | 01212.00079 | 11 شەوال 1325 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی فەرمانبەران
ژمارە ٦٦٢
بـاش کاتیبــی دادگای ســەرەتایی ســانجەقی کەرکــووك ســەید عەلــی ئەفەنــدی ڕاگەیەنــدراوە و هەڵبژێــردراوە، تــا لــە نــاو ویلایەتــی موســڵ لــە قائیمقامیەتێــك دابمەزرێــت، فەرمانــی پاشــای جەنابــی پەیوەندیــداری خەلافــەت بــە پێویســتی زانیــوە جێبەجــێ بکرێــت، بــە نــووسراوی تایبــەت بــە بــاش کیتابەتــی شــکۆداری مابەینــی هومایــۆن ڕاگەیەنــدراوە، بۆیــە نووسراوێکــی بڕیــار و فەرمانــی هومایۆنــی شــاهانە جێبەجــێ کردنــی فەرمــووە، نــووسراوی ســەدرە ئەعــزەم لــە مێــژووی ١ تشرینــی دووەم ١٣٢٣ ژمارە ٢٣١٥ ئامــاژەی پێکــراوە، بــە تۆمــار لــە کاتــی پێداچوونــەوە لــە نــاو ویلایەتــی ناوهاتــوو بەهــۆی مردنــی محەمــەد شــوکری ئەفەنــدی دەرکەوتــووە شــوێنەکەی بەتاڵــە، بۆیــە ناوبراو لــە قائیمقامــی قــەزای ڕانیــە لــە چینــی ســێیەم دەســت بــە کار بێــت، بڕیــار و فەرمــان بــۆ جەنابــی ئــەو کەســەیە کــە فەرمــان دەردەکات.



<table>
<tr><td>7 زیلقەعدە 1325</td><td>01462.000009</td><td>İ.DH</td></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>فەرمانگەی سەدارەت<br>دیوانی هومایۆنی ئێستا<br>٣٥١٣<br>جەنابی ئەفەندم<br>لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ قائیمقامیەتی قەزای رانیـە بە کراوەیـی ماوەتەوە، باش کاتیبی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی کەرکـووك سـەید عەلـی ئەفەنـدی دامەزرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە لـە سـەر هاتنـی نـوسراو نەزارەتـی ناوەخـۆی شـکۆدار بریارنامـە لـە قۆمیسـیۆنی فەرمانبەرانی مولکیـە رێکخراوە و پێشـکەش کراوە، لەگـەڵ کاغەزی وەرگێـردراوی بـاری کەسـێتی راگەیەنـدراوە و پێشـکەش کـراوە، لـەم بابەتـە هـەر چۆنێـك بێـت فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت چ بفەرمووێـت، جێبەجـێ دەکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە نـووسرای بەپەلـە کـراوە ئەفەندم.<br>سەدری ئەعزەم</td></tr>
</table>




| BEO | 003020.226455 | 11 سەفەر 1325 |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

لەسەر بەردەوام بوونی کاری چەتەگەریان، لە کاتی خۆی دەستگیرکراون و بۆ رۆژئاوای تەرابلوس و بەنغازی و ئەدەنە دوور خراونەتەوە، دواتر چەتەکانی هەمەوەند بەهەر شێوەیەك بێت هەڵاتوون و گەراونەتەوە شارۆچکەی بازیان ئەو شوێنە کۆنەی کە کاری چەتەیان تێدا ئەنجام دەدا، بەڵام مەفرەزەی جیاجیا لە ٣٠ تا ٤٠ ئەسپ سواریان پێك هێناوە وەکو جاران دەستیان بە پەلاماردانی خەڵك و زیان گەیاندن کردووە، هەروەها لەبەر خراپەکاری ئەوانە کشتوکاڵ و کاری بازرگانی تووشی وەستان هاتووە، ئەو تەلەگرافنامەیەی کە لە کەرکووك دەرچووە لەگەڵ راگەیاندن و ئاماژە پێکردن داوا لە سەروو کراوە، لەسەر زانیاری پێشووی بارودۆخی ئەوانە ئەمجارە بە تێروانین لە رووداوەکان لێکۆڵینەوە لە توندوتیژی چەتەکان کراوە، هەرچی زووە دەستگیر بکرێن و توندوتیژی و پەلامار و زیانی ئەوانە لە خەڵکی ملکەچبوو دوور بخرێتەوە و بپارێزرێن، ئەگەر پێویستیش بکات مەفرەزە لە ئاڵای سوارە پێك بهێنرێت و کار بکەن بۆ دوورخستنەوەی ئەوانە، فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت فەرموویەتی بە گوێرەی ئەو کارە هەرچی زووە ئەنجامەکەی رابگەیەندرێت، چۆنیەتیشی بە لایەنی سەربازی راگەیەندراوە، لە نێوان باش کیتابەتی شکۆداری هومایۆنی ملوکانە بە نووسراو راگەیەندراوە، بە نووسراوێکی بریار و فەرمانی هومایۆن هیممەت بکرێت بۆ جێبەجێ کردنی کارەکان.




BEO.003066.229906.001

<table>
<tr><td>BEO</td><td>003066.229906</td><td>15 ڕەبیعی کۆتایی 1325</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>موتەسـەرفی پێشـووی سـانجەقی کەرکـووك میـری میـران مەحمـود بـەگ بـە پشـت بەسـتن بـە بریارنامـەی تایبەتـی بریـارەکان مووچەیەکـی ١٦٨٧ قوروشـی بـۆ ببرێتـەوە، بـە بریـاری شـورای دەوڵـەت جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا ڕەزامەنـدی نیشـان داوە، کارەکـە جێبەجـێ کـراوە، بـۆ ڕاگەیاندنـی نـووسراو کـراوە.</td></tr>
</table>



BEO.003145.235806.001

| 4 شەعبان 1325 | 003145.235806 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دادی شکۆدار لایەنی عالی

سـەرۆکی سـزای دادگای سـەرەتایی سـەرفیجە ئیسـماعیل سـەعدی ئەفەنـدی لەگـەڵ سـەرۆکی سـزای پـروزە گۆرینەوەیـان پـێ بکرێـت، هەروەهـا یاریـدەدەری داواکاری گشـتی هۆبـەی سـاری ئەحمـەد نیـازی ئەفەنـدی لەگـەڵ یاریـدەدەری داواکاری گشـتی قەوالـە سـادق ئەفەنـدی گۆرینەوەیـان پـێ بکرێـت، جگـە لەمـە سـەرۆکی سـزای دادگای سـەرەتایی سـانجەقی کەرکـووك ئیبراهیـم فـەوزی ئەفەنـدی بەهـۆی خـراپ بەکارهێنانـی ئەرکەکـەی دەدرێتـە دادگا لـە ئێسـتاوە دوور بخرێتـەوە و لـە شـوێن ئـەو یاریـدەدەری داواکاری گشـتی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی کنـج بەکـر سـدقی و سـەرۆکی پێشـووی دادگای سـەرەتایی قـەزای لۆشـنە عوسـمان ئەفەنـدی لـە یاریـدەدەری داواکاری گشـتی دامەزرێـن، هەروەکـو یاسـا سـوێندی یاسـایی بخـۆن، بـۆ ئەمـەش لـە مێـژووی ٢٥ رەجـەب ١٣٢٥ ژمـارە ٤٤٣ نـووسراوی سـەروو و پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا لـە مێـژووی ٣ شـەعبان ١٣٢٥ رەزامەنـدی نیشـان داوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.





BEO.003183.238707.001

| 8 شەوال 1325 | 003183.238707 | BEO |
| --- | --- | --- |

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
بـاش کاتیبـی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی کەرکـووك سـەید عەلـی ئەفەنـدی لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ لـە قەزایـەك وەکـو قائیمقـام هەڵبژێردرێـت و رابگەیەندرێـت، ئەمـەش بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت راگەیەنـدراوە، لـە مابەینـی هومایۆنـی ملوکانـەی بـاش کیتابەتـی شـکۆدار بـە نـووسراوی تایبەتـی ئـاگاداری نێـردراوە، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجێکردنـی بریـاری هومایۆنـی شـاهانە.




BEO.003195.239608.001

| BEO | 003195.239608 | 21 شەوال 1325 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی بەهیە
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ٢٧ ڕەبیعی یەکەم ١٣٢٤، داهاتی ئاوقافی شەریفەی سانجەقی کەرکووك لە کاتی خۆیدا حەواڵەی لایەنی سەربازی بووە، بە نەقد نێردراوە، ئەوەی ماوەتەوەش بەهای زەخیرە دەکاتە ٦٩٤ هەزار و ٥٥٤ قوروش پێویستە بە پەلە ڕەوان بکرێت، لەلایەن جەنابی شێخی حەرەمی شەریفی نەبەوی و بەڕێوەبەرایەتی نووسراوی هاوبەش نێردراوە، بە راگەیاندن و دووبارەکردنەوەی هەروەها بە گوێرەی ئاگاداری پێشوو هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی و راگەیاندنی.



| 1325 زیلحیجه 3 | 003226.241934 | BEO |
|---|---|---|
| نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>لە ناو ویلایەتی موسڵ بۆ قائیمقامیەتی قەزای رانیە سەید عەلی ئەفەندی باش کاتیبی دادگای سەرەتایی سانجەقی کەرکووك دادەمەزرێت، لەم بارەیەوە لەسەر نووسراوی ١٩ شەوال ١٣٢٥ ژمارە ٣٤٦٤ بە بریاری قۆمیسیۆنی فەرمانبەرانی مولکیە لە مێژووی ٢ زیلحیجە ١٣٢٥ فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت رەزامەندی نیشان داوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی. | | |


Y.PRK.AZN 25/34

Y.PRK.AZN.00025.00034.001

| Y.PRK.AZN | 00025.00034 | 21 موحەررەم 1326 |
|---|---|---|

نەزارەتی داد و مەزهەبەکان
قەڵەمی تۆمار
وێنەی ئەم مەزبەتەیە کە بۆ بابی عالی نێردراوە
یاریـدەدەری داواکاری گشـتی دادگای سـەرەتایی سـانجەقی دیوانیـە جەمـال ئەفەنـدی و سـەرۆکی دادگای سـەرەتایی قالمینـوز مەقسـود ئەفەنـدی لەسـەر بابەتـی جۆراوجـۆر ئەرکەکەیـان بـە خراپـی بەکارهێنـاوە، لـەم بابەتـەدا لێکۆڵینـەوە ئەنجـام دراوە، لـە ئەنجامـی ووردبینـی کردنـدا بریـار دراوە بدرێنـە دادگا، تـا کۆتایـی هاتنـی دادگایەکەشـیان گونجـاو نییـە سـەرۆکایەتیە ناوهاتـووەکان بـە وەکالـەت بەرێـوە بربردرێـت، لـە ئێسـتاوە لـە کارەکانیـان دوور بخرێنـەوە و کەسـانی گونجـاو دابمەزرێـن، بـە تێروانیـن بـەم ئاماژەیـەی کـە لـە بـارەی یاریـدەدەری داواکاری گشـتی هاتـووە وا بـە بـاش زانـراوە ئەرکەکـەی بگوازرێتـەوە، یاریـدەدەری داواکاری گشـتی سـانجەقی کەرکـووک ئیبراهیـم ئەرکەکـەی بگوازرێتـەوە بـۆ دوا شـوێن، هەروەهـا یاریـدەدەری داواکاری گشـتی سـانجەقی سـلێمانی شـەعبان زوهـدی داوای کـردووە ئەرکەکـەی بگوازرێتـەوە بـۆ یاریـدەدەری کەرکـووک، بـۆ یاریـدەدەری سـلێمانیش یاریـدەدەری داواکاری گشـتی پێشـووی سـانجەقی ئورفـە شـەریف ئەفەنـدی کـە لـە ئەرکەکـەی دوورخراوەتـەوە و لـە ئەنجامـی ئـەم ووردبینیـەی کـە کـراوە بریـار لەسـەر بەکارهێنانـەوەی دراوە، هەروەهـا بـۆ سـەرۆکایەتی دادگای سـەرەتایی قالمینوزیـش سـەرۆکی دادگای سـەرەتایی ناحیـەی قلونیـەی مەدللـی عوسـمان و بـۆ شـوێنی ئەویـش سـەرۆکی دادگای سـەرەتایی ناحیـەی یـەرەی سـەر بـە مەدللـی عوسـمان نـوری دابنرێـت، بـەم شـێوەیە بـۆ سـەرۆکایەتی یـەرەش یاریـدەدەری داواکاری گشـتی پێشـووی دادگای سـەرەتایی قـەزای کسریـە لـە ئەنجامـی لێکۆڵینـەوە لـە ئەوراقـی دوورخسـتنەوەی بریـار لەسـەر بەکارهێنانـەوەی دراوە و جگـە لەمـە سـالم ئەفەنـدی کـە لـە مەکتەبـی حقوقـی شـاهانە دەرچـووە ئەرکەکانیـان پەسـەند بکرێـت و بـە فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەت سـوێندی یاسـایی بخـۆن و بگوازرێنـەوە سـەر ئەرکەکانیـان بـۆ چۆنیەتـی کارەکـەش مۆڵـەت و راگەیانـدن پێویسـتە.



Y.PRK.ASK.00255.00082.001

| 19 ڕەبیعی یەکەم 1326 | 00255.00082 | Y.PRK.ASK |
|---|---|---|

پایەی سەر عەسکەر
قەڵەمی تۆمار
تایبەتی
تەلەگرافنامە لە قوماندانی لەشکری شەشەمی هومایۆن هاتووە، لە نێوان دەستەی تابووری ڕەدیفی رواندز و دەسەڵاتداری ناوەخۆ سەعید بەگ بەردەوام گفتوگۆ و شکایەت هەیە، بۆ لێکۆڵینەوە لەم بابەتەدا لە لایەنی سەربازی و مولکیە لە هەر یەکە فەرمانبەرێك دابمەزرێت و ڕەوان بکرێت، بە گفتوگۆکردن لەگەڵ ویلایەتی موسڵ لەلایەنی مولکیە ئەندامی ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی کەرکووك حاجی عەلی ئەفەندی دامەزراوە، بەم ڕاگەیەندراوە لە لایەنی سەربازیش داواکراوە لە ئاڵای ۳۳ی سوارە میری ئاڵای ئەنیس بەگ دابمەزرێت، بۆ جێبەجێ کردنی بابەتەکە بە دامەزراندنی فەرمانبەر لەلایەنی مولکیە، لەبارەی دامەزراندنی میری ئاڵای ئەنیس بەگ بە تەلەگرافنامە ئاگاداری دراوەتە قوماندانی ناوهاتوو و لە وەڵامدا جێبەجێ کردنەکەی بەردەستە، ڕاگەیەندراوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
سەرعەسکەر ڕزا



DH.MKT.01279.00025.001

| 13 ڕەجەب 1326 | 01279.00025 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەفتەرخاقانی عالی
مەلحـە سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك بـە سـەنەدی خاقانـی لـە ژێـر دەسـتی ئەودایـە، بـەڵام ٥ لەلایـەن فەرمانبەرانـی ئەملاکـی پاشـا بـە ناحـەق لـە نـاو خشـتەی ئەملاکـی پاشـا تۆمـار کـراوە، لەسـەر خسـتنە بـەردەم عەتەبـەی پاشـای ملوکانـە جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا مافـی پاراسـتنی داوا کـردووە، بـەڵام کارەکـە جێبەجـێ نەکـراوە، بۆیـە داوای کـردووە زەوی ناوهاتـوو بدرێتـەوە خـۆی و ڕادەسـتی بکرێـت، لـە سـەیدەکانی بەرزنجـی و دانیشـتوی کەرکـووك عومـەر ئەلحوسـەینی ئەفەنـدی داواکاری پێشکەشـی جەنابـی عالـی لـە پەیوەندیدارانـی سـەدارەت کـردووە، لەبـەر ئـەوەی بابەتەکـە لـە بنەرەتـدا پەیوەنـدی بـە نەزارەتـی عالـی نییـە، دوای ووردبینـی هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.




صدارت عظمی مکتوبی قلمی



BEO.002226.166949.001

<table>
<tr><th>6 رەمەزان 1326</th><th>002226.166949</th><th>BEO</th></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ لایەنی واڵای سەر عەسکەریمان<br>تەلەگرافنامەی موسڵ رادەگەیەندرێت<br>پێشەکی بۆ ئاشت کردنەوەی نێوان عەشیرەتەکان ئەرکی پێ سپێردرابوو، دوای ئەوەی لە کارەکەی سەرکەوتوو بوو، مۆڵەتی یەك مانگی پێ دراوە کە کەشوهەوای بگۆڕێت، بۆیە ئەمڕۆ لە لایەنی بەیروتە، جگە لەمە بە کارەکانی دڵسۆزی و لێهاتوویی بینراوە، میری لیوای رەدیفی سلێمانی یوسف پاشا شایەنی ئەوەیە پلەی فەریقی پێ بدرێت، هەر لەگەڵ دامەزراندنی لە قوماندانیەتی فرقەی ١٢ و ئەرکی چاکسازیەکەی پێ سپێردرا، کە داهاتی سانجەقەکانی کەرکوك و سلێمانی لەسەر راگەیاندنی پلەی پێشووی و تێکچوون و وون بوونی داهاتەکەی ئەوا هاوکاری سەربازی لە پلەیەکە کەموکوری تێ دەکەوێت، بۆیە بە پێویست زانراوە چارەسەر بکرێت و چاکسازی تێدا بکرێت، هەروەها هەرچی زووە فەریق موحسین پاشا لەوێ هەڵبگیرێت و لە تەلەگرافنامەی ویلایەتی موسڵ ئاماژەی پێکراوە، جگە لەمە ئاماژەی پێکراوە لەسەر هەندێك ووتە تەلەگرافی بریارنامەی ئەنجوومەنی کارگێری سانجەقی سلێمانی لەسەر جموجۆڵی نەگونجاوی موحسین پاشا نێردراوەتە لایەنی سپاهیدار، بەپەلە کارەکە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت.</td></tr>
</table>





BEO.003352.251343.001

| BEO | 003352.251343 | 9 جەمادی کۆتایی 1326 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی دادی شکۆدار لایەنی عالی

بە دوورخستنەوەی یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی سانجەقی دیوانیە جەمال ئەفەندی و مەقسود ئەفەندی سەرۆکی دادگای سەرەتایی قالمینوز بۆ یاریدەدەری داواکاری گشتی دیوانیە ئیبراهیم ئەفەندی یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی کەرکووك بۆ شوێنی ئەویش یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی سلێمانی شەعبان زوهدە ئەفەندی، هەروەها بۆ یاریدەدەری داواکاری گشتی سانجەقی سلێمانیش یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی پێشووی سانجەقی ئورفە شەریف ئەفەندی هەروەها بۆ سەرۆکایەتی دادگای سەرەتایی قالمینوز، سەرۆکی دادگای سەرەتایی ناحیەی قالونیە عوسمان ئەفەندی و بۆ شوێنی ئەویش سەرۆکی دادگای سەرەتایی ناحیەی یەدە عوسمان نوری ئەفەندی، بۆ سەۆکایەتی ناوهاتووش یاریدەدەری داواکاری گشتی دادگای سەرەتایی پێشووی قەزای کیسریە سالم ئەفەندی بگوازرێنەوە و دابمەزرێن، لەم بارەیەوە لەسەر نووسراوی مێژووی ٢٣ جەمادی یەکەم ١٣٢٦ ژمارە ٢٢٦ جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بە فەرمانی پاشا لە مێژووی ٧ جەمادی کۆتایی ١٣٢٦ فەرمانی داوە، هیممەت بکرێت لە جێبەجێ کردنی.




BEO.003355.251586.002

| BEO | 003355.251586 | 12 جەمادی کۆتایی 1326 |
|---|---|---|

فەرمانگەی گشتی ئەرکانی جەنگی

یەکەی سێیەم

١٠٧٣

ڕاگەیەندراوی بەندەیە

ساڵی ١٣٢١ کانوونی یەکەم تابوری ڕەدیفی موسڵ پڕ چەك کراوە و مۆڵەتی پێدراوە، لە هەمان مێژوودا تابورەکانی کەرکووك و کۆی سانجەق و بەعشیقەش پڕ چەك کراون و ڕەزامەندی وەرگرتنی مۆڵەتیان پێ دراوە، لە کۆتاییدا تابوری ڕەدیفی سلێمانی پڕ چەك کراوە و لە کەرکووك و چەمچەماڵ بەکار هاتوون و نیشتەجێ کراون، لە سنجاریش تابوری نیزامیە بلۆکێکی بۆ ئاسایشی خۆچێی تەواوە و کارەکە بەڕێوەدەبردرێت، سێ بلۆکەکەی تریش بۆ موسڵ دەنێردرێن، لەم حاڵەتەدا مۆڵەتی ئەو چوار تابوری ڕەدیفەی کە باسکراوە دەبێتە هۆی ئەوەی لە دڵنیایی پاراستن و ئەرکی خاڵەکان غەدریان لێ نەکرێت، بە ئاماژەی ویلایەتی موسڵ لە قوماندانیەتی لەشکری شەشەمی همایۆن تەلەگرافنامە هاتووە و لەسەر نووسینی لەگەڵ وێنەی ئاماژە پێکردنەکە گونجاوە و تەواوە، بۆ ئەمەش جێبەجێ کردنی گۆڕینەوەی شوێنەکانیان بە مۆڵەتدانی تابورەکانی ڕەدیفی کەرکووك و کۆی سانجەق و بەعشیقە و موسڵ بە فەرمانی پاشای جەنابی پەیوەندیداری خەلافەت بووە، بەتەلەگرافنامەش قوماندانیەتی لەشکری ناوهاتوو ئاگادار کراوەتەوە، لەم بابەتە بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.

ڕزا سەر عەسکەر



| 11 رەجەب 1326 | 003372.252874 | BEO |
| --- | --- | --- |

بۆ بریکاری بەهیەی نەزارەتی ناوەخۆ
بـە پشـت بەسـتن بـە بریارنامـەی تایبەتـی بریـارەکان موتەسـەرفی پێشـووی سـانجەقی کەرکـووك میـری میـران سـالم پاشـا مانگانـە ١٦٨٧ قـوروش مووچـەی دوورخراوانـی بـۆ دابیـن دەکرێـت، بـۆ ئـەم مەبەسـتە بـە بریـاری شـورای دەوڵـەت جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت بـە فەرمانـی پاشـا رەزامەنـدی نیشـان داوە، بـە راگەیاندنـی نـووسراو کـرا تـا کارەکـە جێبەجـێ بکرێـت.




DH.MUİ..00001.1.00084.003

| DH.MUİ | 00001.1.00084 | 9 شەعبان 1327 |
| --- | --- | --- |

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمارکردن
ئەو شیفرەیەیە لە کەرکوك لەلایەن والی موسڵەوە هاتووە
لـە بازیـان بـە جێبەجـێ کردنـی ڕێکخسـتنی ئیـدارە، لەگـەڵ دەسـت بـەکار بوونـی سـەرۆکی دیوانـی عورفـی و ئەندامەکانـی، دەبـێ بێنـە ناوچەکـە، چەمچەمـاڵ کـە مەرکـەزی بازیانـە، لـە گوندێکـی بچـووك پێکدێـت، لـە چەنـد فەرمانبـەر و خانـەی هەژارێـك زیاتـر نییـە، هەرچـی هەمەوەندەکانـە بـە بەزاندنـی سـنوور لـە نـاو ئێـران بوونیـان هەیـە، تـا ئێسـتا ئەوانـەی دەسـتگیرکراون نزیکـەی ٥٠ تاوانبـار، گرتووخانەیەکـی تایبـەت نییـە تـا ئەمانـەی تێـدا بپارێزرێـت، هەروەهـا قشـڵە و ناوچـەی میـری بوونـی نییـە، کاریگـەری عیبرەتکارانـەی دەبێـت، بۆیـە پێویسـتە رووبەڕووبوونـەوەی گشـتی ئەنجـام بدرێـت، ئەگـەر بێتـو کـەس ئـاگاداری ئـەم کارە نەبێـت ئـەوا ناگەنـە مەبەسـت، لـەم بابەتـەدا بـە پشـت بەسـتن بـە فەرمـان کاری هەمەوەنـدەکان دەگەڕێتـەوە بـۆ دەسـتەی عورفیـە، جێبەجـێ کردنەکـەش لـە مەرکـەزی سـانجەقی سـلێمانی کـە ١٢ کاتژمێـر دوورە یاخـود کەرکـووك کـە ٨ کاتژمێـر دوورە بکرێـت، لـە بەرامبـەر هـەر ئەگەڕێکـدا دەسـتەی ناوهاتـوو و تاوانبـاران بهێنرێنـە ئێـرە سـوودی دەبێـت، جێبەجـێ کردنەکـەی بـە فەرمـان دەبێـت.
والی و قوماندان فازڵ فەریقی یەکەم



DH.EUM.MH.00005.00012.002

| 24 رەمەزان 1327 | 00005.00012 | DH.EUM.MH |
|---|---|---|

١٩٢
بەڕێوەبەرایەتی ئەمنیەتی گشتی عالی
میری میرانی ئەفەندم
بینایـەك نییـە تـا فەرمانبەرانـی پۆلیسـی سـانجەقی کەرکـووك تێـدا نیشـتەجێ بـن، لەلایـەن موتەسـەرفی کەرکووکـەوە ئامـاژەی پێکـراوە مانگانـە بـە ٥٠ قـوروش شـوێنێك بـە کرێ بگیرێـت، هەروەهـا دەرماڵەیەك نییـە تا بۆ پۆلیسـەکان کرێیەکـە ڕێك بخرێـت، تـا ئێسـتاش بودجـە نەهاتـووە، جگـە لەمـە بەبـێ ڕەزامەنـدی خـەرج کردنـی ئاقچـە گونجـاو نابێـت، بـۆ ئەمـە حەواڵـە نامـە نێـردراوە، لـە سـەر ئامـاژەی عالـی لـە ژمێریـاری ویلایـەت گفتوگـۆی لەسـەر کـراوە، بـۆ جێبەجـێ کردنـی کارەکـە هـاوکاری عالـی دەوێـت، بریـار لـە جەنابـی ئەفەندیمانـەوە دەبێـت.
بریکاری والی موسڵ نائیب





DH.MUİ..00034.1.00049.002

| کۆتایی شەوال 1327 | 00034.1.00049 | **DH.MUİ** |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار

جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم

پزیشـکی دەرمانـی شـارەوانی سـانجەقی کەرکـووك لادراوە، لەسـەر داوای خـۆی دیمـتری پریکلـی ئەفەنـدی مووچـە و خەرجـی ڕێـگا بـە گوێـرەی نیـزام لـە ئەنجوومەنـی پزیشـکی مولکیـە و تەندروسـتی گشـتی پەسـەند کـراوە، لـە هۆبـەی تۆماریـش مامەڵەکـەی تۆمـار کـراوە، بـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە، بـە ڕۆیشـتنی بـۆ شـوێنی ئەرکەکـەی خەرجـی ڕێـگای پـێ دەدرێـت، لـە مێـژووی دەسـت بـە کاربوونـی مووچەکەشـی لـە سـندوقی خانەنشـین و دوورخراوانـی مولکیـە مامەڵەکـە جێبەجـێ دەکرێـت، لـە شـوێنی خـۆی بڕیارنامـەی جێبەجـێ کردنەکـە دەرچـووە، لـەم بابەتـەدا بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.

سەرۆکی ئەنجوومەنی پزیشکی مولکیە و تەندروستی گشتی بەسیم عومەر



| 16 شەعبان 1327 | 00131.00086 | MV |
|---|---|---|

پوختەی دارایی

ڕێکخستنی بازیان کراوەتە ڕاپۆرت، ئەگەرچی دیوانی جەنگی عورفی لە جێبەجێ کردنی ئەرکەکە داوەت کراون، مەرکەزی بازیانیش لە گوندێکی بچووک پێکهاتووە، تاوەکو ئێستا نزیکەی ٥٠ تاوانبار دەستگیر و دەستبەسەرکراون، بۆ پاراستنی ئەوانە گرتووخانە هەبێت و بۆ سەربازی ئامادەبووش قشلەیەك هەبێت و لەگەڵ شوێنی میری بوونی هەبێت، بۆ ئەم مەبەستەش دەستەی دیوانی جەنگی بۆ سەنجاقەکانی سلێمانی یاخود کەرکووك بگوازرێتەوە هەروەها تاوانبارانی ناوهاتوو ببردرێنە ئەوێ و دەست بەسەر بکرێن، بۆ ئەم کارەش ڕەزامەندی نیشان دراوە، لەلایەن پاشای والی موسڵ ڕاگەیەندراوە، بۆ ڕەزامەندیش لە نەزارەتی ناوەخۆ لە مێژووی ١٣ شەعبان ١٣٢٧ ژمارە ٢٣٠٨ نووسراو خوێندراوەتەوە.

بریار

بە تێروانین لە وێنەی ڕاگەیەندراوی ناوهاتوو دیوانی جەنگی لە گوندی باسکراو بهێڵدرێتەوە، ئەوا گونجاو نییە و بەرژەوەندی تێدا نییە، بە گوێرەی ئاماژە پێکردنێکەوە دەستەی دیوانی جەنگی بگوازرێتەوە سلێمانی، هەروەها دەستبەسەرەکانیش بگوازرێنەوە ئەوێ، جێبەجێ کردنی ئەم مامەڵەیە لە نەزارەتەکانی جەنگی و ناوەخۆ نووسراوی بۆ کراوە.



| 1327 شەعبان 16 | 00132.00005 | MV |
|---|---|---|

پوختەی بابەتەکە
لە داهاتی ئەم ساڵەدا بەشی پێداویستی ناوەخۆ ناکات، بۆیە لە سانجەقەکانی موسڵ و کەرکووك لەگەڵ تەل شەعیر و دەورووبەری دەرچوونی زەخیرە بۆ ویلایەتی بەغداد قەدەغە کراوە، بە ئاماژەی ویلایەتی موسڵ بە پایەی نەزارەتی ناوەخۆ راگەیەندراوە، لە وەڵامی ئەم ئاگاداریەی کە پێشووتر نێردراوە، لە ویلایەتی ناوهاتوو تەلەگرافنامە وەرگیراوە هاوپێچ ئەمجارە لە نەزارەتی ناوهاتوو نووسراوی مێژووی ٦ شەعبان ١٣٢٧ خوێندنەوەی بۆ کرا.

بریار
لە تەلەگرافنامەی ناوهاتوو دە یەکی ئەم ساڵی سانجەقی موسڵ حەواڵە کراوە، ساڵی رابردوو بینراوە زەخیرەکان کەمن، داهاتی نوێش کەمە، ئەگەر بێتو بەردەوام رەوانی دەرەوە بکرێت، ئەوا پێداویستی ناوەخۆ تووشی قاتوقری دەبێت، بەڵام قەدەغەکردنی هەناردە کردنی زەخیرە لە ویلایەتێك بۆ ویلایەتێکی تر لە بنەرەتدا گونجاو نییە، ئەم ئاماژەیە نەبینراوە دووپاتکردنەوە دراوەتە ویلایەت و لە وەڵامدا بۆ ئاگاداری ئاماژەی نەزارەتی ناوهاتوو کراوەتە نووسراو.



| 24 جەمادی کۆتایی 1327 | 01098.00063 | ŞD |
|---|---|---|

نەزارەتی سندوقەکانی خانەنشین و دوورخراوانی مولکیە
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٠٥٧٩
کاتیبی ئاوقافی نەبەوی سانجەقی کەرکووك عەبدوڵڵا قەدری ئەفەندی مردووە، لەلایەن کوڕەکانی بە ناوی محەمەد ساڵح ئەفەندی و محەمەد سەعید ئەفەندی لەگەڵ کچەکانی خەدیجە و فەخریە و فاتیمە و خێزانەکەی هیندی خان داواکاری نێردراوە داوای دابین کردنی مووچە دەکەن، داواکاریەکە دراوەتە ویلایەتی موسڵی عالی، هاوپێچ خشتەی ماوەی خزمەت و ئەوراقی پەیوەست بەم بابەتە نووسراو لە ژمێریاری رێکخراوە، لەگەڵ پۆستەی هەژماری لە دەستەی گشتی ووردبینی بۆ کراوە. لە پۆستەی ناوهاتوودا خزمەتی پێشووی ناوبراوی مردوو لەگەڵ بڕی ئەم مووچەیەی کە وەریگرتووە، بە بریاری فەرمانبەرانی خانەنشینی مولکیە ناوبراو ١٨٠ قوروشی بۆ دەبڕێتەوە، ماوەی خزمەتی ناوبراو شایەنی ئەوەیە خانەوادەی ناوبراو ئەم مووچەیە وەربگرێت، لەمانە زیاتر کەسی تری نییە، بە گوێرەی بڕیارەکانی بریارنامەی ناوهاتوو مووچەکە گونجاوە و یەکسانە، بۆیە مامەڵەکە جێبەجێ بکرێت، نووسراو کراوە تا لە سندوق مووچەکە دابین بکرێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.




DH.MKT.02724.00059.001




DH.MKT.02724.00059.002

| DH.MKT | 02724.00059 | 4 موحەررەم 1327 |
|---|---|---|

سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی نێردراوان
٢٣١ گشتی
٦٦ تایبەتی
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
دەرماڵەکەیان ڕێکخراوە و بەردەستە، خەریکە دەخرێتە ناو بودجەوە، لە سانجەقەکانی بەسرە، مونتەفیك، نەجەر، عەمارە، ماردین، موسڵ، کەرکووك، سلێمانی و تفر بۆ هەر یەکە نێردراوێك هەڵبژێردراون، بە ئاماژەی پەلە کردن پەیوەندیداری نەزارەت داوای هیممەتی کردووە، بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
سەرۆکی ئەنجوومەنی نێردراوان

حاجی عەلی ئەفەندی، ساڵح پاشا لە کەرکووك
لە سلێمانی هێشتا کەس هەڵنەبژێردراوە، لە تەلەگرافنامەی ٥ کانوونی دووەم ١٣٢٤ رادەگەیەندرێت.



DH.MKT.02778.00007.004

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>02778.00007</td><td>27 سەفەر 1327</td></tr>
<tr><td colspan="3">سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی نێردراوان<br>ژمارە ٥٣٥<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>گوندی مەلحەی سەر بە سانجەقی کەرکووك بە سەنەدی خاقانی لە ژێر دەستییەتی و بەرێوەی دەبات، بە تۆمارکردنی لە نەخشەی ئەملاکی هومایۆن، بە زۆرەملێ لە خەزینەی تایبەتی جێگیر کراوە، لە کۆتاییدا بۆ خەزینەی دارایی بەجێ هێڵدراوە، بە مەبەستی گەرانەوەی پێنج پارچە زەوی بە ناوی تەل هیلال و حاوی سەردانی لایەنی پەیوەندیدار کراوە، بەڵام هیچ سوودێکی نەبووە، بە گوێرەی ئەم سەنەدانەی کە لە ژێر دەستییەتی، بۆ گەرانەوەی زەوییە دەستبەسەرکراوەکە، دەبێ بزانرێت چۆن پارێزگاریشی لێ دەکرێت، بە واژووی شێخ حوسێن ئەفەندی زادە عومەر کەرکووکی داواکاری پێشکەش کراوە، ئاگاداری دراوەتە نەزارەتی شکۆدار و لە ئەنجوومەنیش بریار لەسەر داواکاریەکە دراوە، هەروەها داواکاریەکەش بە مەرجی گەرانەوە لەگەڵ هاوپێچەکانیەوە پێشکەش کراوە، بۆ ئەوەی کارەکە جێبەجێ بکرێت و رابگەیەندرێت بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>سەرۆکی ئەنجوومەنی نێردراوان ئەحمەد رزا</td></tr>
</table>



| 5 جەمادی یەکەم 1327 | 02826.00040 | DH.MKT |
|---|---|---|

فەرمانگەی ئەرکانی گشتی جەنگی
هۆبەی مەرکەز
٨٠٥
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار لایەنی عالی
راگەیەندراوی بەندەیە
سانجەقەکانی سلێمانی و کەرکووك بەهۆی ئەم کەسانەی کە بە ئازادانە هەڵسوکەوت دەکەن ئاسایشی ناوچەکە تێك چووە، بەمەش ئاڵوگۆری کەلوپەلی بازرگانی وەستاوە، بۆیە زۆربەی بازرگانەکانی بەغداد بە واژووی خۆیان تەلەگرافنامەیان ناردووە، بە گفتوگۆکردن لەگەڵ لایەنی پەیوەندیدار بۆ بەرقەرار کردنی ئاسایشی ناوچەکە ئامادەکاری پێویست بکرێت و ئاماژە بۆ بریکاری قوماندانی لەشکری شەشەمی همایۆن نێردراوە، چاوەڕێ دەکرێت پەیوەندیدارانی نەزارەت لەم بارەیەوە بریاری جێبەجێ کردنی کارەکان بدەن، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری جەنگی

DH.MKT.02832.00020.002

DH.MKT.02832.00020.002

| DH.MKT | 02832.00020 | 29 رەبیعی کۆتایی 1327 |
| --- | --- | --- |

سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی نێردراوەکانی شکۆدار
لە سانجەقەکانی سلێمانی و کەرکووك بەهۆی ستەمکارانەوە ئاسایش تێکچووە، کاری بازرگانی وەستێندراوە، بازرگانی ئێمە لەگەڵ سلێمانییە، لەبەر هاتنی چەتەوە ناتوانین کەلوپەل بنێرین، ئەم حاڵەتە هەم بۆ خەزینەی دەوڵەت هەم بە شێوەیەکی گشتی بۆ بازرگانەکانی بەغداد بە زیادەوە کێشەی دروست کردووە، بەم شێوەیەش ئەمنیەتی بازرگانی جێگیر نییە و شڵەژاوە، بە تەواوەتی بازرگانی وەستێندراوە، بۆ ئەم کارەش مەرجەکانی حوکمی تێدا قەبوڵ ناکرێت حاڵەتێکی سەرپێچیکارانە و نەگونجاو روو بدات، بۆ گەرانەوەی ئاسایشی سانجەقەکانی ناوهاتوو تکا دەکەین، فەرمان.

حەفیری زادە یاسین بازرگان/ ئیلیا عەبدولعەزیز بازرگان/ موختار زادە بازرگان/ شاول خاخام سەقبل بازرگان/ سەید قاسم بازرگان/ عەلی عەبدولرەزاق زیا بازرگان/ یەحیا بازرگان/ یوسف شەنتوب بازرگان/ مستەفا جادر بازرگان/ سەید جەواد بازرگان/ عەرزە ساسون بازرگان/ سەلمان حاجی داود بازرگان/ ئیبراهیم حەقیل بازرگان/ محیەددین بازرگان/ نەسیم بەشاعی بازرگان/ جەعفەر جەواد عەبدولرەزاق بازرگان/ داود شەنتوب بازرگان/ شاول ساڵح ئەلیاهو بازرگان/ روبیل یەعقوب شوحیتە بازرگان/ ئەسمەق عەزرە بازرگان/ مونشی بازرگان/ حەقیل یەهودا بازرگان/ یوسف جبرائیل عەباجی بازرگان/ ئەسمان روبیل بازرگان/ حەقیل شەماس بازرگان/مونشی شوحیت بازرگان




DH.MKT.02832.00031.003

| DH.MKT | 02832.00031 | 16 جەمادی یەکەم 1327 |
| --- | --- | --- |

قەڵەمی تۆمارکردنی ناوەخۆ
بۆ نەزارەتی جەنگی عالی
وەڵامـی نـووسراوی مێـژووی ١٢ مایـس ٣٢٥ی بەهیـەی عالییـە: ماوەیەکـی زۆرە لـە سـانجەقەکانی کەرکـووك و سلێمانی ئـەوەی بینراوە لـە تێکچوونـی ئاسایش و بارودۆخەکـەی، وای لێهاتووە زیاتـر زۆربـەی هـەژاری هۆزەکانی نـاو ویلایـەت تووشـی هێـرش و دەسـت درێـژی بێتـەوە، لەبـەر ئـەوەی چەتەکانـی هەمەوەنـد بـە گوێـرەی پێویست تەمبێ نەکراون، بۆیە دەرکەوتووە زیاتـر پـێ درێژیان کـردووە، بـە گفتوگۆکـردن لەگـەڵ قوماندانیەتـی لەشـکری شەشـەم بـە پێویسـت زانـراوە برێکـی پێویسـت هێـزی سـەربازی بنێردرێـت، هەروەهـا بـۆ لێکۆڵینـەوە لەسـەر رووداوەکـەی موسـڵ دوای گەیشـتنی تابورەکانـی لەشـکری چـوارەم لێکۆڵینـەوەکان فراوانتـر دەکرێـن و ئـەو سـەربازە گومانلێکراوانـەی کـە دامـەزراون هەڵبگیرێـن، بـەم هەمـوو خەرجیـەی کـە کـراوە ئـەو لێکۆڵینەوانـەی بـەرەو پێـش چـووە پەکیـان دەکەوێـت، بۆیـە لـە پاشـکۆکانی ویلایـەت سـەر لـە نـوێ ئاسایشـەکەی جێگیـر بکرێـت، ئـەو هۆکارانـەی دەبنـە رووداوی دڵتەزیـن تـا دەرچوونـی ئەنجامـی لێکۆڵینـەوەکان پیـادە و سـوارەی سـەربازی شـاهانەی ئـەوێ نەچنـە هیـچ شـوێنێکی تـر، بـۆ ئـەم مەبەسـتە دوو تەلەگرافنامـە لـە ویلایەتـی موسـڵ دەرچـووە، وێنەکانیـان نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە بەرابیەکانـی هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی کارەکـە.



DH.MKT.02892.00050.001

<table>
<tr><td>DH.MKT</td><td>02892.00050</td><td>18 رەجەب 1327</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>مێژووی ١٨ تەممووز ١٣٢٥ هاوپێچی تەلەگرافنامەی بەندەمانە، ئەو فەرمانبەرە سەربازانەی بۆ چاودێری کردنی هەمەوەندەکان کار دەکەن یەك تابور ئەرزاق و ئامادەکاری لە کەرکووك بەجێهێڵدراوە، ئەو هێزەی ماوەتەوەش گەیشتوونەتە چەمچەماڵ، ئەو قەڵایەی هەمەوەندەکان کە دەکەوێتە گوندی موزەفەریە خاڵی بووە و لەلایەن سەربازەکانەوە دەستی بەسەر داگیراوە، هەروەها لەبەر ژەهراوی بوون ٨ کەس مردوون، ئەمەش لەلایەن قوماندانی هێزی چاودێری میر ئاڵای مەزهەر بەگ راگەیەندراوە.<br>رەشید والی موسڵ</td></tr>
</table>




DH.MKT.02900.00092.001

| 28 رەجەب 1327 | 02900.00092 | DH.MKT |
|---|---|---|

بۆ جەنابی پەیوەندیدارانی سەدارەت
دیوانـی جەنگـی عورفـی لـە قـەزای بازیـان ڕێکخسـتنی بـۆ دەکرێـت، لەلایـەن دادوەر فەرمانبـەر دادەنرێـت و لـە نەزارەتی دادوەری شـکۆدار راگەیەندراوە، سـەرۆکی سـزای سانجەقی سـلێمانی رفعەت و یاریدەدەری داواکاری گشتی کەرکـووك شـەریف و ئەندامـی دادگای پێداچوونـەوەی ویلایـەت حامـد ئەفەنـدی دانـراون، لـە بـارەی مووچەکانیـان و خەرجـی ڕێـگا رۆژانـە هـەر یەکـە ١٠٠ قـوروش پێیـان دەدرێـت، لـە بـارەی سـەنەدەکانیش لەم سـاڵەوە لـە داهاتی خۆچێـی لـە خەرجـی چاوەڕێنەکـراو ڕێـك دەخرێـت، هەروەهـا لـە کاتـی یارمەتـی نەدانیـش هەمـوو ڕێکخـراوەکان مامەڵـەکان هەژمـار کـراوە، لـە بـارەی جێبەجـێ کردنـی بـە ووتـەی ژمێریـاری راگەیەنـدراوە و مۆڵەتـی پـێ دراوە.

بۆ نەزارەتی دادوەری شکۆدار
نـووسراوی مێـژووی ١ ئۆغسـتۆس ١٣٢٥ ژمـارە ٢٦٣ وەڵامـی سـەرووە، لـە سـەر فەرمانـی دامەزراندنـی دیوانـی جەنگـی عورفیـەی قـەزای بازیـان، ئـەو ناوانـەی لـە فەرمانبەرانـی دادوەری کـە ناویـان هاتـووە، بـۆ ڕێکخسـتنی خەرجـی ڕێـگا و رۆژانەیـان لەلایـەن پەیوەندیـداری سـەدارەت مۆڵەتـی پێـدراوە، لـە کاتـی هاتنـی وەڵامەکـە، بـۆ مامەڵـەی پێویسـت بـە پێویسـت زانـراوە هـەر ئێسـتا زانیـاری بـۆ نەزارەتـی شـکۆدار رەوان بکرێـت.



| ŞD | 03063.00018 | 4 شەوال 1327 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی سندوقی خانەنشین و دوورخراوانی مولکیە
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٤٥
بۆ سەرۆکایەتی شورای دەوڵەتی عالی
جەنابی لێبووردەی ئەفەندم
بە ئەرك لە حەلەبە، بە زیادکردنی ماوەی خزمەتی لە ساڵی ١٣١٣ لەلایەن نێردراوی کەرکووك محەمەد ساڵح ئەفەندی داواکاری هاوپێچ نێردراوە، بەم راگەیەندراوە لەم بابەتەدا خوێندنەوەی بەندەمان کراوە، نووسراوی ١٣ ئۆغستۆس ١٣٢٥ ژمارە ٣٦ ی پەیوەندیداری سەرۆکایەتی حەواڵەی ژمێریاری کراوە، ناوبراو ماوەی خزمەتی لە کەرکووك بە گوێرەی ماددەی ٧ی یاسای خانەنشینی فەرمانبەرانی مولکیە نیشان دراوە، ماوەی دوورخراوانی بێ مووچە سنووردارە و لە سندوق لە فەرمانگەی یاسا مامەڵەکە بە ئاسایی خۆی دراوەتە پەیوەندیداری سەرۆکایەتی، ئەمەش لە ژمێریاری باسکراوە و داواکاری ناوبراو هاوپێچ نێردراوەتەوە، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
بە ناوی نازری سندوقی خانەنشین و دوورخراوانی مولکیە



BEO.003624.271799.002

| 28 ڕەجەب 1327 | 003624.271799 | BEO |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٢١١٨
بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
ڕاگەیەندراوی بەندەتانە
دیوانی جەنگی عورفی لە قەزای بازیان دادەمەزرێت، لەلایەن دادوەرەکەیەوە فەرمانبەرانی دادەنرێن، بە نەزارەتی دادوەری شکۆدار ووتراوە، لە سانجەقی سلێمانی سەرۆکی سزا ڕەفعەت و یاریدەدەری داواکاری گشتی شەریفە لە کەرکووك هەروەها ئەندامی دادگای ئیستینافی ویلایەت حامد ئەفەندی، بۆ برینەوەی مووچەی ناوبراوان، خەرجی ڕێگا و ڕۆژانە هەر یەکە ١٠٠ قوروشیان بۆ براوەتەوە، لەم ساڵەوە لە داهاتی خۆچێی بۆ ڕێکخستنی خەرجی پێویست، هەروەها لە ڕاپۆرتی هاوکاری بۆ جێبەجێ کردنی مامەڵەی هەژمارکردن بە ووتەی ژمێریاری ڕاگەیەندراوە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
نازری ناوەخۆ


BEO.003677.275747.001

| 1327 زیلحیجە 3 | 003677.275747 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆی عالی
لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ بـۆ قائیمقامیەتـی قـەزای کـۆی سـانجەق بـە ئامـاژەی ویلایـەت، بەڕێوەبـەری تۆمـاری پێشـووی سـانجەقی کەرکـووك بـووە، حاجـی حەسـەن ئەفەنـدی بـە مەبەسـتی دامەزراندنـی لـە وەکالەتـی قائیمقامیەتـی ناوهاتـوو نـووسراوی سـەروو لە ٢٩ تشرینـی دووەم ١٣٢٥ ژمـارە ٣٣١٢ بە ڕەزامەنـدی ١ کانوونی یەکەم ١٣٢٥ فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت فەرموویەتـی، هیممـەت بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.



| 8 شەوال 1328 | 00056.1.00005 | DH.İD |
|---|---|---|
| بۆ بریکاری ویلایەتی موسڵی بەهیە<br>بـە گوێـرەی ئاگاداریـەکان لـە نـاو سـانجەقی کەرکووك دە یەکـی موقاتەعەکانـی عەنـکاوە و داروش هەڵـەی تێدایە و هاوشـێوە نییـە، بـۆ ناردنـی راسـتییەکان و هەڵگرتنـی خزمەتـەکان بـە تەواوەتـی بەشـێکی حەواڵەکـە ناکرێـت، دوای مۆڵـەت ئـاگاداری و پێچەوانـەکان مامەڵەکـە نەکراوە، لەسـەر ئاماژەی نەزارەتی دارایی شـکۆدار ئـاگاداری دەنێردرێت. | | |




BEO.003632.272345.003

| BEO | 003632.272345 | 16 شەعبان 1327 |
|---|---|---|

بابی عالی
فەرمانگەی کاروباری ناوەخۆ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٢٣٤٨
بۆ جەنابی پەیوەندیداری نەزارەت
ڕاگەیەندراوی بەندەیە

هاوپێچـی نـووسراوی ١٦ ئۆغسـتۆس ١٣٢٥، لـە عەقـرە لەسـەر کاری سـەرپێچی و جموجۆڵـی چەتەگـەری بـە تونـدی لێـدراون و دوورخراونەتـەوە، لـەوێ بـە پەلـە کارگێریەکـی عورفـی ڕابگەیەندرێـت، بـە خێرایـی گەندەڵـی لەناوببردرێـت و ئەوانـەی هـۆکاری ئـەو کارانـەن تاوانەکانیـان بەسـەر ساغ بکرێتـەوە و سـزا بدرێـن، بـۆ ئەمـەش دەبێـت کارگێـری عورفـی لـە عەقـرە و دەوروبـەری ڕابگەیەندرێـت، هەروەهـا ئـەو دیوانـی عورفـی جەنگیـەی بـۆ قـەزای بازیـان دادەمەزرێـت، بـۆ هـەردوولا گشـتگیر بێـت، عەقـرە و بازیـان لـە ناوەراسـت دەبێـت، هەروەهـا فرقـەی نیزامیـە مەرکەزەکـەی لـە کەرکـووك بێـت، بـە گوێـرەی بـارودۆخ و بەرژەوەنـدی گونجـاو بێـت، ئەمجـارە لـە ویلایەتـی موسـڵ تەلەگرافنامـە وەرگیراوە و پێشـکەش کراوە، بۆ ناردنیشـی بە تێروانیـن لە ڕاگەیانـدن و ئاماژەپێکردن چۆنیەتـی مۆڵەتەکـەی پەلـەی لێکـراوە، بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
نازری ناوەخۆ




| BEO | 003721.279023 | 8 رەبیعی یەکەم 1328 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی دارایی شکۆدار
قەبوڵ کردنی ملکەچ بوونی هەمەوەندەکان بۆ مەملەکەت دەبێتە زیان، بۆیە بە واژووی شێخی قادریە عەلی و هاوەڵانی لە مەرکەزی کەرکووك تەلەگرافنامە دەرچووە، دانەیەکی لەم تەلەگرافنامانە بردراون، بۆ جێبەجێ کردنی کارەکەش وەکالەتی قوماندانیەتی لەشکری شەشەم ئاگادار کراوەتەوە، لە وەڵامدا بە گوێرەی پێداچوونەوەی رووداوەکە و لیستی هەژمارەکان زانیاری راستەقینە دراوە، دوای کوشتنی شێخ سەعید لە موسڵ، بۆ تۆڵەسەندنەوە ئامادەکاری کراوە، لە چەمچەماڵیش سێ پارچە تەلەگرافنامە دەرچووە، لەگەڵ ئەو پارچە تەلەگرافنامانە لەلایەن ناوبراو عەلی و هاوەڵانی نێردراون، قوماندانیەتی هێزی چاودێری ئاگادار کراوەتەوە کە لەسەر ئەوە ماوەتەوە دانەیەك لەو تەلەگرافنامە باسکراوانە بدرێتە قوماندانیەتی هێزی چاودێری، لەم بارەیەوە بە ووتەی تەلەگرافخانە هاتووە تا فەرمان لە بابی عالیەوە نەیەت دانەیەك لەم تەلەگرافنامەیەی پێ نادرێت، دوای ناردنی نووسراو ئەو سێ پارچە تەلەگرافنامەیەی کە لە چەمچەماڵ دەرچووە، پێویستە وێنەیەکیان بدرێتە قوماندانیەتی هێزی ناوهاتوو، بە گوێرەی هەندێك ووتە لە نەزارەتی جەنگی شکۆدار نووسراو هاتووە لە ٤ مارت ١٣٢٦ ژمارە ٥١ بۆ سەروو نێردراوە، بە پشت بەستن بەمە ئاگاداری پێویست دراوەتە بەرێوەبەرایەتی گشتی تەلەگراف و تەلەفۆن کە هیممەت بکرێت.




دائرۀ صدارت تحریرات قلمی



BEO.003804.285231.001

| 8 رەمەزان 1328 | 003804.285231 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دارایی شكۆدار
بـۆ جێبەجـێ كردنـی كارەكان ئەفسـەرەكانی رەدیفـی لەشـكری شەشـەمی هومایـۆن، ئاغـای قـول عـەواد سـەبری ئەفەنـدی لـە ئـاڵای ٩٠ تابـوری یەكەمـی كـۆی سـانجەق مانگانـە بـە ١٢٨٦ و ئـاڵای رەدیفـی ٩١ی تابـوری چوارەمـی مەرگـەی بلۆكـی ١٥ یوزباشـی محەمـەد ئەفەنـدی ٩٥٠ و لـە تابـوری ناوهاتـوو بلۆكـی ١٥ مولازمـی یەكـەم عەبدولرەحـمان ئاغـا بـە ٦٩١ و لـە ئـاڵای رەدیفـی ٩٢ی تابـوری سـێیەمی قـەرەداغ مولازمـی دووەمـی بلۆكـی دەیـەم عەلـی ئەفەنـدی بـە ٦٣٧ قـوروش مووچـەی مانگانـە خانەنشـین دەكرێـن، ناوبراوان عـەواد سـەبری ئەفەنـدی مووچەكـەی لـە دارایـی كـۆی سـانجەق و عەبدولرەحـمان ئاغـا مووچەكـەی لـە دارایـی كەركـووك و ئەوانـی تریـش مووچەكەیـان لـە دارایـی سـلێمانی وەردەگـرن، لـەم بارەیـەوە لەسـەر راپۆرتـی نەزارەتـی جەنگـی شـكۆدار لـە مێـژووی ٢٣ ئۆغسـتۆس ١٣٢٦ ژمـارە ١٢٨٥ بـە رەزامەنـدی مێـژووی ٢٩ ئۆغسـتۆس ١٣٢٦ فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت فەرموویەتـی، هیممـەت بكرێـت لـە جێبەجـێ كردنـی.




| DH.MB.HPS | 00034.00041 | 1 رەمەزان 1329 |
|---|---|---|

بۆ ویلایەتی موسڵی شکۆدار
گرتووخانەی قەزای سەڵاحیەی سەر بە سانجەقی کەرکووك پەنجەرەیەکی بچووکی هەیە، بۆ هەوا گۆڕین، هیچ دەروازەیەکی تری نییە، بۆیە لە هەوا و رووناکی بێبەشە، هەروەها لە هاوین لە گەرمان و زستانیش لە شێ زۆر خراپە، بۆیە ئەم رێرەوە تەرك بکرێت و جۆڵ بکرێت، لە ناو قۆناغی حکوومەت گرتووخانەیەکی گونجاو دروست بکرێت، ئەمەش بە راپۆرتی پشکێنەری مولکیە ئاماژەی پێکراوە، بە ئاگاداری گشتی ٣ مارت ١٣٢٧ ووردبینی و پشکنینی پێویست ئەنجام دراوە، ئەوراقەکانی نێردراوە، هیممەت بکرێت.




DH.MB.HPS.00085.00021.002

| DH.MB.HPS | 00085.00021 | 22 زيلحيجه 1329 |
| --- | --- | --- |
| ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە ١٤٦<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم<br>بـۆ تۆمارکردنـی دەرماڵـەی گاردیانەکانـی گرتووخانـەی قەزاکانـی نـاو سـانجەقی کەرکـووک لـە بوودجـەی ١٣٢٨ داوای هـاوکاری کـراوە، لەسـەر ئـەم پێویسـتە بـە ووتـەی ژمێریـاری ویلایـەت راگەیەنـدراوە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.<br>بە ناوی والی موسڵ نائیب | | |

| 1329 سەفەر 20 | 003859.289424 | BEO |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی دەفتەر خاقانی عالی
عەبدولوەهـاب ئەفەنـدی لـەو کاتـەی کـە فەرمانبـەری دەفتەرخاقانـی سـلێمانی بـووە، بـە بەرزکردنـەوەی پلەکـەی لـە عەمـارە بـە فەرمانبـەری دەفتەرخاقانـی دامـەزراوە، لەسـەر داوای ناوبـراو لە ئەرکی پێشـووی دەهێڵدرێتـەوە و لە شـوێن ئـەو نـوری ئەفەنـدی کاتیبـی تابـوری مەرکـەزی کەرکـووك لـە عەمـارە دەسـت بـە ئەرکەکـەی دەکات، لـەم بارەیـەوە بـە رەزامەنـدی لـە مێـژووی ٢٠ کانوونـی دووەم ١٣٢٦ فەرمانـی پاشـای جەنابـی پەیوەندیـداری خەلافـەت فەرموویەتـی، لـەم بابەتـە وێنەی پەسـەند کـراوی بریارنامـە هاوپێچ نێـردراوە، هیممەت بکرێـت لـە جێبەجێ کردنی.



BEO.003888.291533.003

| BEO | 003888.291533 | 25 رەبیعی کۆتایی 1329 |
| --- | --- | --- |

نەزارەتی دارایی
بەڕێوەبەرایەتی گشتی داهات
یەکەی چوارەم
٢٥٩٥ گشتی
٦١ تایبەتی
بۆ جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
پوختە: لە نێوان کەرکووک و سلێمانی دامەزراندنی شۆفێری بە کەفیل.
ڕاگەیەندراوی بەندەیە
بـۆ ئـەوەی لـە نێـوان کەرکـووک و سـلێمانی کاری پۆسـتە بـە ڕێکوپێکـی بەڕێوەبچێـت، لـە دەسـتەی گشـتی ئەنجوومەنـی نێـردراوان بڕیـار دراوە، لەسـەر بڕیارنامـەی سـەروو کـە لـە مێـژووی ١٥ مایـس ١٣٢٦ ژمـارە ٤٦٥ بـە بڕیارنامـە هاتـووە، لـە وەڵامـی ئـەو ئاماژە پێکـردن و ڕاگەیەنـدراوەی کـە پێشـووتر هاتـووە لـە بەڕێوەبەرایەتـی گشـتی پۆسـتە و تەلەگـراف و تەلەفـۆن نـووسراو بەدەسـت گەیشـتووە، لـە نێـوان کەرکـووک و چەمچەمـاڵ و سـلێمانی شـۆفێرێکی بـە کەفیـل دابنرێـت، ئەمجارەش لـە مەرکەزەکانـی سـلێمانی و چەمچەمـاڵ پاکێتـی پۆسـتەی ناوەخـۆ هەروەهـا مامەڵـەی نامـەی بـە بەهـا و بـە نـرخ جێبەجـێ بکرێـت، ئەوانـەی کـە کارەکـە جێبەجـێ دەکـەن، چۆنیەتـی کارەکەیـان پـێ ڕابگەیەندرێـت، هەروەهـا مێـژووی مامەڵـەی نێـردراوی دەسـت بـەکار بـوو ئامـاژەی پـێ بکرێـت و ڕابگەیەندرێـت، هەروەهـا لـە سـەرۆکایەتی شـکۆداری ئەنجوومەنـی نێـردراوان نـووسراوی هاوپێـچ بـۆ پێشـەوای سـەروو پێشـکەش کـراوە، بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
ڕاوێژکار بە ناوی نازری دارایی




مابين همايون ملوكانه

باش كتابتى

١٩٩

İ.MBH 10/61 2

İ.MBH.00010.00061.002

| 9 زيلحيجه 1330 | 00010.00061 | İ.MBH |
|---|---|---|

مابەینی هومایۆنی ملوكانە
باش كیتابەت
١٩٩
لـە بـارەی هەندێـك بابەتـی مەركەزەكانـی كەركـووك و بەغـداد و مەعمورەتولحەمیدیـە ٣ پارچـە تەلەگرافنامـە پێشكەشـی سـەروو كـراوە، لەسـەر فەرمانـی عالـی هاوپێـچ دراوەتـە سـەدری ئەعـزەم، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو كەسـەیە كـە فەرمـان دەردەكات.
جەنابی سەر كاتیب




DH.MTV.00036.00003.002

| DH.MTV | 00036.00003 | 16 ره‌بیعی یه‌كه‌م 1330 |
|---|---|---|

شورای دەوڵەت
ژمارە ١٩٨
جەنابی پەیوەندیداری سەدارەت
راگەیەندراوی بەندەیە
لـە نـاو ویلایەتـی موسـڵ ناحیـەی مەلحـە سـەر بـە سـانجەقی كەركـووك لـە هەژمـاری سـاڵی ١٣٢٦ لـە كۆكردنەوەی رسـوماتی سـەرمەڕدا ئەركەكـەی بـە خراپـی بەكارهێنـاوە، لەبـەر ئـەم پروپاگەندەیـەدا گومانلێكـراوە، بۆیـە دراوەتـە دادگا، لـە بـارەی بێتاوانـی تەحسـیلداری پێشـووی سـوارەی كەركـووك عەزیـز ئەفەنـدی بریـار دەرچـووە، بـەڵام لـە دژی ناوبـراو ژمێریـاری سـانجەقی كەركـووك حوكمـی سـەرەتایی دەركـردووە، بـۆ رەتكردنـەوەی لـە ئەنجوومەنـی كارگێـری ویلایەتـی موسـڵ بریـاری ئیسـتیناف لەلایـەن بریـكاری خەزینـەی شـكۆداری موسـڵ داواكاری پێداچوونەوە پێشـكەش كـراوە، لـە لیسـتەكەش داواكاری نارەزایـی رەت كراوەتـەوە، بریـاری پێداچوونـەوە پەسـەند كـراوە، ئیعلامیـش لـە دادگای پێداچوونـەوەی شـورای دەوڵـەت رێكخـراوە و هاوپێـچ پێشكەشـی جەنابـی پەیوەندیـداری سـەدارەت كـراوە، چۆنیەتـی كارەكـە و پـارەی ئیعلامەكـە كـە دەكاتـە ١٠٠ قـوروش لـە بریـكاری داواكاری پێداچوونـەوە داواكـراوە، ئـاگاداری دراوەتـە نەزارەتـی ناوەخـۆی شـكۆدار، زانیاریـش دراوەتـە نەزارەتـی دارایـی شـكۆدار، بـۆ جێبەجـێ كردنـی مامەڵەكـە بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەم كەسـەیە كـە فەرمـان دەردەكات.
سەرۆكی شورای دەوڵەت/ باش كاتیب



DH.MB.HPS.00036.00019.003

| DH.MB.HPS | 00036.00019 | 17 جەمادی یەکەم 1330 |
|---|---|---|

نەزارەتی دارایی
بەڕێوەبەرایەتی مولکی میری
٢٣٠٤ قەڵەمی یەکەم
ژمارە
٦٣٠٣ گشتی
١٥٠ تایبەتی
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
پوختە: لە بارەی کاغەزەکانی دروست کردنی گرتووخانەی کۆی سانجەق.
دووبـارە بـە پێویسـت زانـراوە لـە کـۆی سـانجەق گرتووخانەیـەك دروسـت بکرێـت، بـۆ خەرجـی دروسـت کردنەکـەی، ٨٦٧٠ قـوروش دانـراوە، بـۆ ڕەزامەنـدی وەرگرتـن لەسـەر خـەرج کردنـی ئـەو بـڕە پارەیـە بـە ئامـاژەی موتەسـەرفیەتی کەرکـووك، لـە ویلایەتـی موسـڵ نـووسراو لـە مێـژووی ٧ کانوونـی یەکـەم ١٣٢٧ ژمـارە ١٩٧ بـۆ نێـردراوە، تـا سـاڵی ١٣٢٨ دەبـێ جێبەجـێ بکرێـت، لـە یەکـەم فەرمانـدا نـووسراوی شـکۆداری ٥ مـارت ١٣٢٧ ژمـارە ٣/٣٥٧٩١، سـەبارەت بـە جـێ بەجـێ کـردن و ڕاگەیاندنـی ئەنجامەکـەی ووردبینـی بـۆ کاغـەزە نێـردراوەکان کـراوە، ئەنجامـی ووردبینیەکـەی لـە دەسـتەی هونـەری ڕاپـۆرت دراوە لەگـەڵ وێنـەی پەسـەندکراوی هاوپێـچ پێشکەشـی پەیوەندیـداری نـەزارەت کـراوە، بـە ڕاگەیاندنـی ڕێزوسـڵاو ئەفەنـدم.
بەڕێوەبەرایەتی مولك بە ناوی نازری دارایی



| 17 شەعبان 1330 | 00087.00012 | DH.MB.HPS |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٢٧
سەبارەت بە وەرگرتنی ڕەزامەندی خەرج کردن و خەرج نەکردنی خەرجی ڕێگای گواستنەوەی مستەفا ئاغای گاردیان.
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی ئەفەندیم
ئەو فەرمانبەرانەی کە لە شوێنێك بۆ شوێنێکی تر دەگوازرێنەوە ئەگەر پێویست بکات خەرجی ڕێگایان بۆ خەرج بکرێت، لە ڕووی خزمەتەوە کارەکە ئەنجام بدرێت، ئەوانەی ئەرك جێبەجێ دەکەن، لە بارەی خەرج کردنی خەرجی ڕێگا، هیچ فەرمانێك نەدراوە، لە گاردیانەکانی گرتووخانەی کەرکووك مستەفا ئاغا بۆ گاردیانی گرتووخانەی کۆی سانجەق گوازراوەتەوە، نووسراوی دابین کردنی خەرجی ڕێگا جێبەجێ دەکرێت یا جێبەجێ ناکرێت دراوەتە لایەنی پەیوەندیدار، لە سەردانی ناوهاتوو و لەسەر ئاماژەی موتەسەرفیەتی کەرکووك ڕادەگەیەندرێت، بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
تاهیر والی موسڵ



DH.MB.HPS.00145.00080.001

| DH.MB.HPS | 00145.00080 | 27 ڕەبیعی کۆتایی 1330 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٩
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
ساڵی ٣٢٧ بۆ کارگێری گشتی گرتووخانە پێنج پارچە خشتە پێشکەش کراوە.

جەنابی ئەفەندم
هاوپێچی نووسراوی مێژووی ١٣ مارت ١٣٢٨ ژمارە ١٠ لە خشتەی ئاماری ساڵی ١٣٢٧ گرتووخانەکان، مەرکەزی سانجەقی کەرکووك لەگەڵ قەزاکانی سەڵاحیە و کۆی سانجەق و رانیە و رواندز پێنج پارچە خشتە هاوپێچ پێشکەش کراوە، هەروەها قەزای سنجار کە سەر بە مەرکەزی ویلایەتە، داد و گرتووخانە نییە، بۆیە خشتە ڕێکنەخراوە، لەم بابەتە بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
والی موسڵ



DH.EUM.MH.00244.00137.001

| 4 رەبیعی یەكەم 1330 | 00244.00137 | DH.EUM.MH |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٨٧
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شكۆدار
جەنابی پایەبەرزی ئەفەندم
هاوپێچـی نـووسراوی مێـژووی ٣ نیسـان ١٣٢١ ژمـارە ٤ كـە بـۆ بەڕێوەبەرایەتـی ئەمنیەتـی گشـتی عالـی نووسراوەتـەوە، گرنگـی كارگێـری سـانجەقی كەركـووك و گەورەیـی و فراوانـی ڕووبـەری ناوچەكـە و لەبـەر ئـەوەی زۆربـەی ناوچەكانـی تایبەتمەنـدی خـۆی هەیـە، پێویسـتە پارێـزگاری لـە ئەمنیەتـی بكرێـت و لـە بـارەی مافـی گشـتی مامەڵـەی داد جێبەجـێ بكرێـت، بـە پشـت بەسـتن بـە مـاددەی ١٢ ی بەراییـەكان بـۆ هـەر قەزایـەك دوو پۆلیـس و بـۆ مەركـەزی لیـوا یاریدەدەرێـك و ٢٥ پۆلیـس لـە بوودجـەی سـاڵی داهاتـوودا تۆمـار دەكرێـت، لەسـەر ئامـاژەی موتەسـەرفی لیـوای ناوهاتـوو و ووتـەی بەڕێوەبەرایەتـی پۆلیـس ڕاگەیەنـدراوە، لـەم بابەتـەدا بریـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو كەسـەیە كـە فەرمـان دەردەكات.
والی موسڵ تاهیر



ML.EEM.01128.00020.001

| 17 جەمادی یەکەم 1330 | 01128.00020 | ML.EEM |
|---|---|---|

بۆ دەفتەرداری ویلایەتی موسڵ
تـکای کـردووە ئـەو مولکـەی لـە قـەزای هەولێـر کـە پشـتاو پشـت بـۆی ماوەتـەوە رادەسـتی بکرێـت جەنابـی سـوڵتان سـەلیم خانـی خوالێخۆشـبوو لـە یەکـەم هەنـگاو بەغـدادی فەتـح کـرد و دەسـتی بەسـەر داگـرت، باپیـرە گـەورەی کورەجـی رەسـەن حەسـەن پاشـا بەهـۆی کاریگـەری دەرخسـتنیەوە بـووە جێـگای رەزامەنـدی جەنابـی ناوبـراو وەکـو پاداشـت لـە قـەزای هەولێـر لـە ناحیـەی دزەیـی گوندەکانـی دووگـردکان و قورشـاقلۆ و میـراوە سـوریش سـیران ترپـە سـپیان دووکەلـە قـازی خانـە بـە فەرمانـی عالـی شـان بـە رێگـەی پشتاوپشـت دراوەتـە ناوبـراو، ئـەو گوندانـە لـەلای باپیـرە گـەورەوە و دوای خۆشـی کورەکـەی ئەحمـەد ئاغـا لـە ئەویـش بـە رێگـەی گواسـتنەوە لەلایـەن باپیـری عەبدوڵـڵا ئاغـا بـە فەرمـان بـە بـێ کێشـە بـەکاری هێنـاوە، ئـەو بریارنامـەی لـە دەسـتی بـووە پەسـەند بـووە، بـە گوێـرەی ئـەو ووتانـەی بـاس کـراوە بـە فەرمانـی ناوهاتـووی تۆمارکـراو مولکـی ناوهاتـوو بـە رادەسـت کردنـی لـە قـەزای هەولێـری سـەر بـە سـانجەقی کەرکـووك نیشـتەجێ لـە گەرەکـی سـەرای یەکێـك لـە نەوەکانـی کورەجـی حەسـەن پاشـای خوالێخۆشـبوو لەلایـەن خالیـد ئاغـا کـوڕی دەروێـش ئاغـا مولکەکـە دراوەتـە ناوبـراو، داواکاری ٢٩ مـارت ١٣٢٨ دووبـارە نووسراوەتـەوە و نێـردراوە، بـە تێروانیـن لـە داراییەکـەی بـە لێکۆڵینـەوە و ووردبینـی داواکـراوە پەلـە بکرێـت لـە جێبەجـێ کردنـی.





DH.SN.THR.00044.00004.002

| DH.SN.THR | 00044.00004 | 26 ڕەجەب 1331 |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی دەرەوە
بەڕێوەبەرایەتی گشتی کاروباری شەهبەندەر و بازرگانی و یاسای جۆراوجۆر
یەکەی کاروباری شەهبەندەر
ژمارە ٣٩٩-٣٤٢١٠
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
جەنابی ئەفەندم

لە کەرکووک، ڕواندز، کۆی سانجەق، هەولێر، سلێمانی و موسڵ لەگەڵ زۆر شوێنی تر هاووڵاتی عوسمانی بەبێ پاسەپۆرت دێنە ساوچبۆلاق، لەم حاڵەتەدا لە بارەی هاووڵاتی بوونی ئەوانە لەگەڵ فەرمانبەرانی خۆچێی تووشی کێشە و ناکۆکی دەبنەوە، لەم بارودۆخەدا خەزینەش زیانێکی زۆری پێ دەگات، دوای ئەوەش پێویستە هاووڵاتیانی ناوهاتوو ناچار بکرێت پاسەپۆرت دەربهێنن، بۆ ئەمەش نووسراو لە شەهبەندەری ساوچبۆلاق بۆ باڵیۆزی تاران نووسراوە، ئەو نووسراوانەی بۆ نەزارەت ڕۆیشتووە وێنەیەکی هاوپێچ نێردراوە، ئەگەرچی هاووڵاتیانی عوسمانی ئەوانەی دەیانەوێت بچنە وڵاتی بێگانە ناچار کراون پاسەپۆرت هەڵبگرن، بە گوێرەی یاسای پاسەپۆرت تایبەت بە ماددەی ئەو بابەتە سوودی هەیە، پێویستە هاووڵاتیانی عوسمانی پاسەپۆرتیان هەبێت، تاوەکو لەو ڕێگایە ئەگەر تووشی مەترسی ببنەوە لە ڕێگای ویلایەتەکانی ئێرانەوە ئاگادار بکرێنەوە بۆ ئەمەش نووسراو کراوە ئەفەندم.
ڕاوێژکار بە ناوی نازری دەرەوە





HR.UHM.00141.00040.001

| 12 سەفەر 1331 | 00141.00040 | **HR.UHM** |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
١٣٧
بۆ جەنابی دەوڵەت
عیبادەڵڵای ئورمیەیی لە کاتی گەڕانەوە لە زیارەتی شوێنە پیرۆزەکان لە هەولێر کۆچی دوایی کردووە، لە دادگای شەرعی ئەوەی لە دوای بەجێ ماوە کراوەتە دەفتەر و پەسەند کراوە، لە کاتی سەردانی میراتگرەکانی لە موتەسەرفی کەرکووك ئاماژەی پێکراوە، لە کاتی حەواڵەش لە نێوان باڵیۆزی ئێران و نەزارەتی شکۆدار لە نێوانیان بۆتە بڕیار، بە ناردن ئاماژەی پێکراوە، لە مێژووی ٢١ زیلقەعدە ١٢٩٢ و ٨ کانوونی یەکەم ١٢٩١ ڕاپۆرتنامەی ماددەی ٤ ئەو هاووڵاتیانەی ئێران کە لە دەوڵەتی عوسمانی کۆچی دوایی دەکەن، ئەوەی بەجێیان هێشتووە دەستی بەسەر دادەگیرێت، ئەوەی لە بارەی ئەوانەوەیە لە نووسراو و هەموو شتێك پەیوەست دەبێت بە شەهبەندەری ئێران و بریکارەکانیان هەروەها لەبەر ئەوەی لەم ویلایەت شەهبەندەر نییە، چۆنیەتی کارەکەش لە مەرکەزی نیابەتی شەرعی بە نووسراو بە نەزارەتی شکۆدار ڕاگەیەندراوە و نووسراوی بۆ کراوە، بڕیار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
بریکاری والی موسڵ میری لیوا



DH.MB.HPS.00148.00020.001

| 5 جەمادی کۆتایی 1331 | 00148.00020 | DH.MB.HPS |
| --- | --- | --- |

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ٣٤
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
پێشکەش کردنی خشتەی ئامادەبووی گرتووخانەی کۆی سانجەق.
بۆ جەنابی ئەفەندم
پاشکۆی داواکاری ١٤ نیسان ١٣٢٩ ژمارە ٢٥، خشتەی گرتووخانەی کۆی سانجەق ئامادەیە، ئەو خشتەیەی لە موتەسەرفیەتی کەرکووك نێردراوە بە هاوپێچەوە پێشکەش کرا، لەم بارەیەوە بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
والی موسڵ



DH.İD.00183.2.00006.002

| 6 زیلقەعدە 1331 | 00183.2.00006 | DH.İD |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە ١٣٤
بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار
بۆ جەنابی دەوڵەت
لـە کـۆن سـەر بـە ناحیـەی مەلحـە بـووە، لەلایـەن مولکـی میریـەوە بەڕێوەبـردراوە، بـەم دواییـە بـە فەرمانـی نەزارەتـی دارایـی شـکۆدار دراوەتـەوە سـەید ئەحمـەد ئەفەنـدی و سـەید عومـەر ئەفەنـدی، لەسـەر داواکاری بـۆ بەڕێوەبردنـی کارگێـری گونـدی شـەمل و تەلهیـلال بـە گەڕانـەوەی بـۆ ناحیـەی مەلحـە و بەسـتنەوەی هیـچ کێشـەیەك نەبیـنراوە، لـە موتەسـەرفی خۆجێـی گفتوگـۆی لەسـەر کـراوە و لـە مامەڵەکـەی دەرکەوتـووە لـە کۆبوونـەوەی ئەنجوومەنـی گشـتی ووردبینـی بـۆ کـراوە و جێبەجـێ کـراوە، لەسـەر ئاماژەی خۆجێیـش هـەردوو گونـدی ناوبـراو ئێسـتا وەکـو جاران بۆ بەسـتنەوەی بـە ناحیـەی مەلحە لە ئەنجوومەنـی کارگێـری ویلایـەت پەسـەند کـراوە، هەروەهـا چۆنیەتیشـی بـە موتەسـەرفیەتی کەرکـووك ڕاگەیەنـدراوە، زانیـاری ڕاگەیەنـدراوە، بڕیـار و فەرمـان بـۆ جەنابـی ئـەو کەسـەیە کـە فەرمـان دەردەکات.
بریکاری والی موسڵ، میری لیوا ئەسعەد




BEO.004162.312109.001

| BEO | 004162.312109 | 3 جەمادی یەکەم 1331 |
| --- | --- | --- |
| بۆ نەزارەتی جەنگی و نەزارەتی دارایی شکۆدار<br>ئـاڵای ژاندارمـەی ویلایەتـی موسـڵی تابـوری کەرکووکـی بلۆکـی هەولێـری قوماندانـی تاقمـی رانیـە، مولازمـی دووەم ئەمیـن بـەگ مانگانـە ٤٢٥ قـوروش مووچـەی خانەنشـین بوونـی رێکخـراوە و لـە مێـژووی ٢٤ مـارت ١٣٢٩ ژمـارە ٢٥ راپۆرتـی پایەبـەرز نێـردراوە لەگـەڵ لیسـتی فەرمانـی پاشـا بـە مـۆری هومایۆنـی جەنابـی پاشـا داوای پەسـەندکردنی کـراوە، وێنـەی پەسـەند کردنـی بـۆ سـەروو نێـردراوە، هەروەهـا بـۆ نەزارەتـی دارایـی شـکۆدار ئـاگاداری نێـردراوە، بـۆ جێبەجـێ کـردن. | | |

TELEGRAMME تلغرافنامه

دولت علیهٔ عثمانیه تلغراف ادارەسی

ADMINISTRATION DES TELEGRAPHES DE L'EMPIRE OTTOMAN



DH.İD.00177.00017.002

| 16 ڕەجەب 1332 | 00177.00017 | HD.İD |
|---|---|---|

تەلەگرافنامە
لە کەرکووك دەرچووە
بۆ سەدارەتی پایەبەرز
باوکـم شـێخ عەبدولغەفـور ئەفەنـدی لـە کـۆی سـانجەق خانەیەکـی یـەك دەرگایـی لەگـەڵ کۆشـکەکەی بـۆ منداڵەکانـی کردۆتـە وەقـف، بـەڵام لـە نەزارەتـی بەغـداد و لـە کەرکـووك تۆمـار کـراوە و دەسـتی بەسـەرداگیراوە، بەسـتراوەتەوە بـە شـەرعەوە، ئەمـەش ناهـەق و زوڵمـە کـە دەیروخێنن تـا بیکەنە مەکتەب، لێـرە نەمتوانیوە هـاوار و هیمـدادم بگەیەنمـە کەسـێك، بە ناوی شـەریعەت دەمـەوێ قەدەغە بکرێت و تـکا دەکەم رادەسـتی ئێمە بکرێتەوە.
نوری پۆست نشین



DH.İD.00183.1.00034.002

<table>
<tr><td>10 سەفەر 1332</td><td>00183.1.00034</td><td>DH.İD</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی تۆمار<br>ژمارە<br>٢٤٧ تایبەتی<br>بۆ نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>بۆ جەنابی دەوڵەت<br>سەر بە قەزای کەرکووك و لە شارۆچکە پێنج کاتژمێر دووره، دانیشتووانەکەی لە عەشیرەتی شوان پێکهاتوون، رسوماتی مەروماڵاتی گوندەکانی بنە سیدان، کورکەیی، حەساتی، جەلیفە، گۆران و عومەر مەندان سەر بە قەزای بازیانی سلێمانیە، هەروەها داهاتی دەیەکیشی بۆ لیوای کەرکووکە، جگە لەوە مامەڵەی سەربازیشی سەر بە ناحیەی شوانە، بەستراوەتەوە بە فەرمانگەی تابوری رەدیف، بۆ مامەڵەیەکی رێکخراو گوندەکانی ناوبراو حەواڵەی ناحیەی شوانی سەر بە کەرکووك بکرێن و بەم ناحیەیە ببەسترێتەوە، بۆ ئەمەش بە بریاری ئەنجوومەنی گشتی ویلایەت چۆنیەتی جێبەجێ کردنی پەیوەندیداران ئاگادار کراونەتەوە، پەلەش کراوە لە راگەیاندنی زانیاریەکان، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>والی موسڵ</td></tr>
</table>

DH.ŞFR.00428.00004.001

<table>
<tr><td>DH.ŞFR</td><td>00428.00004</td><td>1 رەجەب 1332</td></tr>
<tr><td colspan="3">بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>قازی پێشووی كۆی سانجەق لەگەڵ دوو كەس لە دانیشتوان بەهۆی خراپەكاریەكانیان بدرێنە دادگا، كاغەزی لێكۆڵینەوەیان هەر ئێستا لە موتەسەرفیەتی كەركووك دەربهێنرێت بەپەلە لە دادگا دادگایی بكرێن، چونكە هێشتا لە خراپەكاری بەردەوامن، بە پەلە فەرمانی توند بدرێتە شوێنی خۆیان.<br>حیلمی سەرپەرشتیاری مولكیە</td></tr>
</table>




باب عالی

داخلیه نظارتی



DH.UMVM.00131.00087.001

| 26 زیلقەعدە 1333 | 00131.00087 | DH.UMVM |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی نیشتەجێ کردنی عەشیرەتەکان و پەنابەران
ئـەم ویلایـەت و لیوایانـەی کـە ئەرمەنیەکانـی تێدا نیشـتەجێ دەکرێـت ناوچەکان فـراوان کـراون و گۆڕانکاریـان تێدا کـراوە، وێنـەی بـە شـیفرەی لایەنـی عالـی پەیوەندیـداری نـەزارەت لـە مێـژووی ٢٢ ئەیلـول ١٣٣١ پێشـکەش کـراوە.

ئـەم ناوچانـەی کـە ئەرمەنیەکانـی تێـدا نیشـتەجێ دەکرێـت بـە پێویسـت زانـراوە گۆڕانـکاری تێـدا بکرێـت و فـراوان بکرێـت، ١- لـە سـانجەقی کەرکـووک تـا سـنووری ئێـران بـە رووبـەری ٨٠ کیلۆمەتـر گونـد و شـارۆچکەکان هەژمـار کـراوە، جگـە لەمـە باشـوور و ڕۆژئاوای ویلایەتی موسـڵیش هەژمـار کراوە. ٢- لە سـنووری دیاربەکـر ٢٥ کیلۆمەتریش هەژمـار کـراوە، هەروەهـا ئاوەدانیەکانـی ڕووبارەکانـی خابـوور و فـورات هەژمـار دەکرێـت و باشـوور و ڕۆژئـاوای سـانجەقی زوریـش. ٣- لـە ویلایەتـی حەلـەب بەشـی باکـووری هەروەهـا ڕۆژهـەڵات و باشـوور و باشـووری ڕۆژئـاواش بـە هەمـوو شـارۆچکەکان و گوندەکانیـەوە ئەرمەنیـەکان بـە ڕێـژەی لـە سـەدا ١٠ی ژمـارەی موسـڵمان دابـەش دەکرێـن و نیشـتەجێ دەکرێـن. کارەکـە بـە گوێـرەی ڕێکخسـتن و جێبەجـێ کردنەکـەی رادەگەیەندرێـت.


İ.DUİT.00042

| 24 رەجەب 1334 | 00042.000027 | İ.DUİT |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی زانیاری و تۆماری فەرمانبەران
ژمارە ٨٤٠
فەرمانی پاشا
قائیمقامی پێشووی ساسون سەبری بەگ بە مووچەی پلەی سێیەم لە موتەسەرفیەتی سانجەقی کەرکووك دامەزراوە.

بۆ جێبەجێ کردنی ئەم کارە نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە، لە ٢٤ رەجەب ١٣٣٤، لە ١٤ وایس ١٣٣٢.
نازری ناوەخۆ/ سەدری ئەعزەم




DH.SN.THR.00074.00126.001

<table>
<tr><th>DH.SN.THR</th><th>00074.00126</th><th>25 زیلقەعدە 1334</th></tr>
<tr><td colspan="3">بابی عالی<br>نەزارەتی ناوەخۆ<br>فەرمانگەی گشتی تۆماری ناسنامە<br>١٣٩<br>حەقی بەگ لە کارگێری گشتی قەڵەمی ئامار رۆژانە بە ١٥ قوروش کاری کردووە، ئەمجارە ناوبراو لە بەرێوەبەرایەتی تەحریراتی سانجەقی کەرکووك دادەمەزرێت، لە رۆیشتنی بۆ شوێنی مەبەست لە سەرەتای مانگی داهاتوو تا رۆژی ١١ی هەمان مانگ شایستەکانی وەردەگرێت، بۆ وەرگرتنی رۆژانەی ١٠ رۆژی دەکاتە ١٥٠ قوروش رای جەنابی پەیوەندیداری نەزارەتی دەوێت، لەم بابەتەدا بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەم کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.</td></tr>
</table>




DH.UMVM.00089.00066.004

<table>
<tr><td>DH.UMVM</td><td>00089.00066</td><td>22 زیلقەعدە 1334</td></tr>
<tr><td colspan="3">ویلایەتی موسڵ<br>قەڵەمی تۆمار<br>١٥٧ تایبەت<br>نەزارەتی ناوەخۆی شکۆدار<br>پوختە: سەرۆکی شارەوانی هەولێر هیچ کارێکی خراپی نەبینراوە.<br>بۆ جەنابی نازر بەگ<br>لە بەرێوەبەرایەتی کاروباری ناوەخۆی ویلایەت نووسراوەکانی ژمارە ٢٨٠١ و ٣١ مێژووی ٢ نیسان ١٣٣٢ وەڵامی پەیوەندیداری نەزارەتە، بە گوێرەی ئەو لێکۆڵینەوانەی لە ناوەخۆ جێبەجێ کراوە، دەرکەوتووە سەرۆکی شارەوانی هەولێر هیچ کارێکی خراپی نەبینراوە، لە وەڵامی ئاماژەی موتەسەرفیەتی کەرکووك روون بۆتەوە، لەگەڵ ئەوەش بە مەبەستی ووردبینی کاغەزەکان نێردراونەتە ئەنجوومەنی دەستە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.<br>والی موسڵ</td></tr>
</table>



DH.ŞFR.00525.00071.001



DH.ŞFR.00525.00071.001

| 15 رەمەزان 1334 | 00525.00071 | DH.ŞFR |
|---|---|---|

بۆ نەزارەتی ناوەخۆ
خەلیل پاشا لە قوماندانیەتی لەشکری شەشەم لەسەر گواستنەوەی کەلوپەلی گرنگ لە گفتوگۆکردن دایە، بۆیە خەریکن دێنە کەرکووک، بەرێگەی هەولێر چوومە کەرکووک، بۆ سوود وەرگرتن لەم کارە سەرەتا ئەو نەخۆشخانە ١٠٠ قەرەوێلەیەی کە لە هەولێر کردوومەتەوە و زیاتر لە ٢٠٠ قەرەوێلە بۆ نەخۆشخانەی کەرکووک و ١٥٠ قەرەوێلەش بۆ نەخۆشخانەی سلێمانی رۆیشتووە، بۆ دیر حەریریش و بابا جیمەنیش هەر یەکە ٣٠ چادر رۆیشتووە و لێی دڵنیابوومەوە، بە هەمان شێوەش لە رانیەش بۆ نەخۆشخانەی رانیەش دەگوازرێتەوە، لە موسڵیش لە نەخۆشخانەی مانگی سوری ١٠٠ قەرەوێلەیەی کە دروستم کردووە، ٢٠٠ قەرەوێلە زیاد دەکەم.
والی موسڵ


OSMANLI ARŞİVİ
ML.EEM
1198 10 2

ML.EEM.01198.00010.002

<table>
<tr><th>ML.EEM</th><th>01198.00010</th><th>18 شەعبان 1334</th></tr>
<tr><td colspan="3">نەزارەتی دارایی<br>نووسراو<br>لە قەزاكانی كەركووك و هەولێر سێ پارچە پەیوەستە بە تەلەگرافخانە، لە حكوومەتی عوسمانی رێكخراوە و دەفتەری خاقانی ئەمانەت لە مێژووی ٢٤ نیسان ١٣٢٨ ژمارە ٢٧٢ لەگەڵ نووسراو نێردراوە، چوار پارچە سەنەدی خاقانی پێوەی لكاوە لە مێژووی ٢٨ نیسان ١٣٢٨ فەرمانی پاشا دەرچووە، ئەو سەنەدە باسكراوانە لە خەزینەی دارایی رێكخراوە و لە قەزای كەركووك تەلەگرافخانەی ناحیەی كۆپری سەنەدەكانی تەلەگرافخانەی هەمان ساڵ تۆمار كراوە، تەلەگرافخانەی ناوهاتوو بری ٢١٠٨ قوروش نیشان دراوە، ئەوەی لە تۆمارەكان نیشان دراون، ٢١٢٠٨ قوروش نووسراوەتەوە، ئەگەر بە هەڵە نووسرابێتەوە، بە گوێرەی تۆماری سەنەدەكان كە نووسراوەتەوە راست بكرێتەوە دواتر بنێردرێتەوە.</td></tr>
</table>



ML.EEM.01213.00016.008

| ML.EEM | 01213.00016 | 17 جەمادی کۆتایی 1334 |
|---|---|---|

ویلایەتی موسڵ
قەڵەمی تۆمار
ژمارە
٣٢ تایبەتی
بۆ نەزارەتی دارایی شکۆدار
بۆ جەنابی نازر بەگ
لە قەزای هەولێر ئەو شوێنانەی فەرمانگەی دادوەری کە پێویستی بە نۆژەن کردنەوەیە لە موتەسەرفی کەرکووك کاغەزی دەرخستەی نێردراوە، هاوپێچ پێشکەش کراوە، ئەوەی لە ناوەرۆکەکەی باس کراوە، ٣٢٩٠ قوروش پێویستە حەواڵە بکرێت، بە ووتەی ژمێریاری ویلایەت راگەیەندراوە کە هاوکاری پێویستە، بریار و فەرمان بۆ جەنابی ئەو کەسەیە کە فەرمان دەردەکات.
والی موسڵ حەیدەر


İ.DUİT.00042

| 5 شەوال 1335 | 00042.000064 | İ.DUİT |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
بەڕێوەبەرایەتی زانیاری و تۆماری فەرمانبەران
١٠٤٦ گشتی
فەرمانی پاشا
لە موتەسەرفیەتی سانجەقی کەرکوك بە مووچەی پلەی سێیەم بریکاری موتەسەرفی هەکاری نوری بەگ دامەزراوە.

بۆ جێبەجێ کردنی فەرمانی پاشا نازری ناوەخۆ ئەرکی پێ سپێردراوە، لە ٥ شەوال ١٣٣٥، لە ٢٥ تەمموز ١٣٣٣.
سەدری ئەعزەم و نازری ناوەخۆ


T.C. BASBAKANLIK OSMANLI ARSIVI DAIRE BASKANLIGI (BCA)

OSMANLI ARŞİVİ
DH.İ.UM
10-1 | 2-59 | 3

DH.İ.UM.00010.1.00002.59.003

| 17 زیلحیجه 1336 | 00010.1.00002.59 | **DH.İ.UM** |
|---|---|---|

بابی عالی
نەزارەتی ناوەخۆ
ئەمرۆ بە گوێرەی بارودۆخەکە کەرکووك و دەوروبەری بۆتە ناوچەی جەنگ، هەر جۆرە جموجۆڵێکی سەربەست دەبێ پارێزگاری لێ بکرێت، بۆ پارێزگاری کردن لە کەرکووك ئەو شتانەی کە نەگونجاون نابێ بگوازرێنەوە، هەروەها نابێ ئەو جموجوڵانە سەربەست بکرێت کە دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە حکوومەت، جگە لەوە دەبێ حکومەت لەوە سەربەستتر کار بکات، ئەگەر پێویست بکات بۆ ئەوەی هێزی سەربازی پارێزگاری لە جموجۆڵی سەربەستی خۆی بکات، مەرکەزی لیوای بگوازێتەوە هەولێر، ئەمەش بە قوماندانیەتی لەشکری شەشەم ووتراوە. لە هەنگاوی دواتر کەرکووك یەك مەفرەزەی تێدایە تەنانەت لە کاتی هەر ڕووداوێك لەوانەیە کەرکووك بەجێ بهێڵێ، گواستنەوەی حکوومەت لە کەرکوکەوە بۆ هەولێر گونجاوە، لەوێ کاروباری لیوا بەرێوەببردرێت، هەروەها لە کەرکووکیش قائیمقامی سەلاحیە هەندێك فەرمانبەرانی دارایی حکوومەت نیشتەجێ بکرێن.
والی موسڵ مەمدوح

DH.ŞFR.00575.00040.001

| DH.ŞFR | 00575.00040 | 24 رەجەب 1336 |
|---|---|---|
| بۆ نەزارەتی ناوەخۆ<br>ئیبراهیم بەگ قائیمقامی پێشـووی گولعەنبەر کە ئەو کاتەی لە قائیمقامیەتی رانیە بووە، کاغەزی لێکۆڵینەوەکانی کە پەیوەسـتە بـەم سـەردەمە هێشـتا نەهاتۆتـە کەرکـووک، دووپاتکراوەتەوە لـە ویلایەتیـش بەدواداچوونی بـۆ دەکرێت.<br>مەمدوح والی | | |



DH.ŞFR.00599.00113.001



DH.ŞFR.00599.00113.001

| DH.ŞFR | 00599.00113 | 12 موحەڕرەم 1337 |
| --- | --- | --- |
| لـە ١٨ تشرینـی یەکـەم ١٣٣٤ داقوقیـان داگیرکـردووە، لـەوێ نزیکـەی ٢٠ سـوارە بلـۆك لەنـاو چـوون، یەکێـك لـە ژاندارمـەکان بەدیـل گیـراوە و دووانیـان لەگـەڵ ژاندارمـە هاتوونەتـە کەرکـووك، ئەمجـارە ٦ لـە تەیـارەکان هێرشـیان کردۆتـە سـەر کەرکـووك ئـەو بۆمبانـەی کـە هاوێشـتوویانە ١٠ کەس لـە سـەربازەکانمانیان بریندار کـردووە، ئەمـرۆ بەشـێك لەمانـە نێردراونەتـە هەولێـر، ئەمـەش بـە موتەسـەرفی کەرکـووك نـوری بـەگ ڕاگەیەنـدراوە.<br>والی موسڵ مەمدوح | | |